عەزیز گەردی

# رەوانبێژی

## لە ئەدەبی کوردی دا

بەرگی یەکەم

البیان

# ڕەوانبێــــژی

# لــە ئەدەبی كــوردیدا

## بــەرگی یەكەم

## ڕوونبێژی ـ البیــان ـ

عەزیز گــەردی

# سەرچاوەی زاراوەکان

لەبە ئەوەی ئەم کتێبە بە هەزرێ بەرگرییەوە هەندێ زاراوەی ڕەوانبێژی تیا بەکار هاتووە ، کە تا ئێستا باو نین و هەندێ نووسەر لەسەر ئەو ڕایەن کە ئەو زاراوانە جارێ هەر بە عەرەبی بهێشترێنەوە ، تا ڕۆژی خۆی دێ . بەڵام من وام بە چاك زانی کە ئەم زاراوانە لە نووسینا بە کار بێنم و بۆ ئەوەی بزاندرێ کە من لە خۆمەوە ئەو زاراوانەم نەهێناون بۆیە وا لە خوارەوە سەرچاوەکان تۆمار دەکەم :

١ ـ ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا .. علاء الدین سجادی

٢ ـ دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی .. علاءالدین سجادی

٣ ـ زاراوەی زانستی — نەقابەی مامۆستایان ـ لقی سلێمانی

٤ ـ هەندێ زاراوە زانستی — جمال نەبەز

٥ ـ فەرهەنگی خاڵ — شێخ محمدی خاڵ

٦ ـ فەرهەنگی رابەر — گیو موکریانی ـ

# پێشـــــــەکی

خوێنەری بەڕێز :

ئێستا کە خۆمان بەرامبەر ئەم باسە دەبینین وا چاکە ئەوە پیشان بدەم کە چۆن ؟ وەکەی ؟ وە بۆچی ؟ ملم دایە ئەو باسەو کەوتمە سەر نووسینی ڕەوانبێژی کوردی .

هەر لەوەی سنووری قوتابخانەی ناوەندی بشکێنم ئەوەندە چێژم لەگەڵ شتی ئەدەبی نەئەبزووت بەڵکو تاسەو ئارەزووم بەتێکڕایی ڕووی لە باسە زانیارییەکان بوو . بەڵام ئەو کاتەی کە خۆم لە قوتابخانـــەی مامۆستایانی سەرەتایی دی ، وا ئەکەم لێرە ، ئەو زانیارییانەی دڵیان گۆشی کردبووم بەرەو کزی ئەڕۆنو ئەو شتانەی تا ئێستا چێشـــەم لەگەڵیان نەئەبزووت وەکو باسە ئەدەبییەکان وا خەریکن یەکە خۆیان بەسەرما ساغ ئەکەنەوەو ئەمخەنە داوی خۆیانەوە .. ئیتر ناچار بووم ئەوەی تا ئێستا لە مێشکا بوو بیـڕێنم یاخود بڵێین بیخەمە خەوەوە بەرەو ئەو مەیدانە بێپایانە سنگ بنێم کە لەوێوە ئاڵای هونەرو ئەدەبو نووسین ئەدرەوشێتەوە ، ئیتر ئەوە بوو کەوتمە خوێندنەوەو لێووردبوونەوەی ئەدەبی عەرەبیو کوردی..

هەر لەگەڵ کۆتایی بوونیشم لە قوتابخانە بە تایبەتی پاش ئەوەی کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ لە هەولێر دامەزرام . وا ئەکەم لە لایێ بێ ئیشی دەستم ماچ ئەکاتو لە لایەکی تریشەوە کتێبخانەی گشتی باوەشم بۆ ئەکاتەوە . ئیتر کەوتمە هاتو چۆ بۆ کتێبخانەی گشتی .. لە کتیبانەی ئەمخوێندنەوە زیاتر حەزم لە کتێبی ڕەوانبێژی ئەکرد . ئەوەشیان لە بیر نەچێ لەگەڵ خوێندنەوەی هەر کتێبێکا تێبینیو سەرەقەڵەمی تایبەتیم ئەنووسیەوە تا وای لێهات چەند دەفتەرێکم پڕ کردەوە .. ڕۆژێکیان لە کاتێکا کە ئەو کۆمەڵە دەفتەرەم هەڵئەگێڕاو وەرئەگێڕا ئەکرد لەپڕ شتێکی سەیرم بە بیردا هات کەوتمە پرسیارو لێکدانەوە : ئایا کورد ڕەوانبێژی نییە ؟! ئەی بۆچی تا ئێستا لەم ڕووەوە هیچ هەوڵێکی ڕێکوپێک نەدراوە ؟ بۆچی لەم بە گرنگەی ئەدەب پشت گوێ خراوە ؟ هەر لەم لێکدانەوەیەدا بووم کە

ئەو بیرەم بە مێشکا تێپەڕبوو کە من ئەم ئەرکە بگرمە ئەستۆو بکەومە سەر نووسینی ڕەوانبێژی کوردی .. کەیدی چی یە ؟ با ئەختێکەمو کورتی تیا بێ ! با لە مەودوا ڕۆلە دلسۆزەکانی کورد زمان وورده وورده خاوێنی بکەنەوەو ڕێکی بخەن .. کەمو کورتی تەواو بکەنو زیادەی لێ بڕنەوە .. بۆ ئەوەی ئێمەش وەکو نەتەوەکانی تر بتوانین پڕ بە گەروو دەنگ هەلبڕینو بتوانین بلێین زمانەکەمان خزمەتێکی کراوەو هەولێکی بۆ دراوە ! جا بە هۆی ئەم سەرنجو تێبینییانەو بە پێی ئەو نەخشەی کە بۆ پڕۆژەکەم کێشابووم توانیم بکەومە ئیش کردنەوە .. لە هەمان کاتیشا شالاوم بۆ دیوانو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردی برد بۆ دۆزینەوەی نموونەی تەواوو زیندوو بۆ هەر یەکێ لە پیشە ڕەوانبێژییەکان ، بۆ ئەوەی باسی لێکۆلینەوەکە ساردو سڕو لاوەکی ـ غریب ـ دەرنەچی بەلکو لە جەرگەی ئەدەبێکی خۆڕسکی کوردییەوە هەلبقولێ .. ئەمەوێ ئەوەش دەربخەم کە دژوارترین تەگەرەم کەوتبێتە ڕێ نەبوونی یاخود کەمی سەرچاوەی کوردییە ، لەگەل زاراوەکانی ئەم زانیارییە .. بۆ سەرچاوەکان ناچار بووم هێز بدەمە سەرچاوەکانی عەرەبی ، خۆ ڕەوانبێژیش لە هەموو ئەدەبێکا ، واتە ئەدەبی هەموو میللەتێکا هەر یەکە ئەوەندە هەیە زمانی نووسینەوەو نموونەکان ئەگۆڕێن وبەس ! ئەگینا گەوهەری زانیارییەکە هەمووی هەریەکەو وەك هەر زانیارییەکی تر سەرچاوەکەی بۆ لای یۆنانەکان ئەچێتەوە .

پێش ئەوەی دوا بەم پێشەکییە بێنم ئەمەوێ بلێم ڕەوانبێژی کوردی وەکو ڕەوانبێژی هەر زمانێکی تر ئەکرێ بە سێ بەشەوە :

ڕوونبێژی ـ البیان ـ ، واتاناسی ـ المعانی ـ ، جوانکاری ـ البدیع ـ نیازم وابوو هەر سێ بەشی کتێبەکە پێکەوە لە بەرگێکا چاپ بکەم ، بەلام لە ئەنجامدا ناچار بووم بەش بەش پێشکەش خوێنەرانی بکەم، جارێ وا بەشی یەکەم ئەخەمە بەر چاوانەوە کە ڕوونبێژی ـ البیان ـە تا ئەو ڕۆژەی دێت بەشەکانی تریش بە ڕۆلاکی شاد ئەبن .

ئەوەی پێویستی گوتنە لێرەدا ئەوەیە کەمن دوو [illegible] خۆم بەم

بەرهەمەو. خەریك كرد ، بۆ ئەوەم نەبووەو نییە كە بیكەم بە پرۆگرامێك و لە كاتی نووسینەوەو لێكۆڵینەوەدا پەیڕەوی بكەم چونكە ئەمە باسێكە سەردەمەكەی لە ئێستا بەولاوەترە بەڵام ئەوەندە هەیە هەستم بە كەلەبەرێكی زۆر گەورە ئەكرد كە هەر ئەبوایە پڕ بكرێتەوە بۆ ئەمەش پێ بە پێ ئەچوومە پێشەوەو تا ئەهات زیاتر لەسەری ڕشت ئەبووم !

دوا جار ئومێدەوارم كە ئەم بەرهەمە بچكۆلەیەم جێگای ڕەزامەندی هەموو كوردێكی مەردو دڵسۆز بێت و بەدڵێكی فراوانەوە ئەم دیارییەم لێوەربگرن .

عەزیز گەردی

هەولێر ۱۹۷۰/۱۱/۲۰

# ئەدەبو رەوانبێژی

ئێمە کە ئەمانەوێ لە رەوانبێژی بدوێین پێویستە لە پێشا مانای ئەدەب بزانین ئەو کاتە بێینە سەر رەوانبێژی ...

ئەدەب بە جۆرێکی تێکڕایی ئەو هەموو مرواری قسەی جوانو نەخشی دلفڕێنو نیگاری پەسندو ئاوازی بەجۆش ئەگرێتەوە ، کە لە کۆنەوە لە باوکو باپیران بۆمان ماوەتەوە ؛ جا لەسەر بەرد هەڵکەنرابێ یا لەسەر پێستەی خۆشکراو نووسرابێ یا لە دیواری ئەشکەوتەکان چەسب کرابێ [1] ! بەڵێ ! ئەدەب ئەم هەموو شتانە ئەگرێتەوە لە هەمان کاتیشا بەو هەستە ناسکە ئەڵێین کە لە دڵی ئادەمزاد پەیدا ئەبێو دەر ئەبڕێ . بە وشەی جوانو بەتینو دارشتنی هونەرییەوە دەرئەبڕێ ؛ خۆ ئەگەر دەر نەبڕێ ئەوە ئەبێ بە هەستێکی پەنگ خواردوو و ئەدەب دروست نابێ یاخود ئەتوانین بڵێین ئەدەب : ئەو پارچە نووسراوە بەهێزەیە کە لە سۆزێکی زیندووەوە هەڵقوڵاوەو بۆ بزواندنی سۆزی گوێگر یا خوێنەر هەوڵ ئەدا، ئەمەشیان بە هۆی ئەم بیرو خەیالو شێوە داڕژاوە ئەبێت کە بەجوانترین شێوەو توندترین جۆر دەر ئەکەوێ ! ئەمە هێناو ئیشارەتێکی خێرایی بوو بۆ ئەدەب ئنجا بێینە سەر پەیوەندیو ماوەی نێوان ئەدەبو رەوانبێژی ..

بێ گومان کە ئەدەب گوزارشت لە هەستو نەستی خاوەنەکەی بداتەوە، مانای ئەوەیە کە هەر لەگەڵ پەیدابوونی ئادەمزاد ئەدەب هەبووە ؛ چونکە مادام ئادەمزاد هەبووبێ هەستو هۆشی هەبووە . با هەستەکەی ئەو سای وەکو هەستی ئێستای ناسك نەبووبێ . یا هۆشو ژیری ئەو سەردەمی بەرادەی ئێستا گەشاوەو پێشکەوتوو نەبووبێ . بەلام رەوانبێژی یاخود بڵێین لێکۆڵینەوە پاش داهاتنو پەرەسەندنی ئەدەب بە هەزارەها بەلکو بە ملیۆنەها ساڵ داهاتووە . یەکەم جار لێکۆڵینەوە لە خاکی بە پیتی یۆنانەکانەوە ، چووزەرەی دەرکرد ، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆیەمی پێش میلاد هۆمیرۆس لە (ئەلیازە)و (ئۆزیسە) باسی ئەم

---

(۱) ئەمە پوختەی باوەری مامۆستا ( سجادی )یە بڕوانە الەدەبی کوردیو لێکۆلینەوە لە ئەدەبی کوردی)ل ۹ .

[illegible] لێکۆڵینەوەی ئەم
سەردەمە وەکو ئەدەبەکەی دەوری بەرایی لە قالبێکی ڕێكو ڕەوانا نەمەبی
بوو . بەلام هەر هاتە پێش‌و سەرکەوت تا لە سەدەی چوارەمی پێش میلاد
پالەوانێکی ئاقڵای لێ ڕاست هات ، (ئەرەستۆ)ی لێ پەیدا بوو کە ئەو
لێکۆڵینەوەی خستە بەرگێکی ڕێكو پێکەوە .. ئیتر هەر هاتو
گەشایەوە پەرەی سەند تا هەموو زمانەکانی تریشی گرتەوە .. لێرەدا لە
ئەنجامی زۆر لێدوان‌و بۆتەلە کردن بەلای هەندێ نەتەوە — وەکو
عەرەبەکان — ئەم لێکۆڵینەوەیە بە دوو فلیقالی سەرکەوت‌و بەرز بووەوە !
لقێکی بوو بە ڕەوانبێژی — البلاغة — لقەکەی تریشی بوو بە ڕەخنە
— النقد — یاخود کە مامۆستا (علاء الدین سجادی) هەر بە (لێکۆلینەوە)
ناوی ئەبات .

جارێ ئێمە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئەدەب پێش ڕەوانبێژی ئەکەوێ
واتە عەرەب گوتەنی « ئەدەب سابقەو ڕەوانبێژی لاحقە » چونکە پێویستە
ئەدەبەکە هەبووبێ ئنجا لەپاش شێ کردنەوەو لێکدانەوەیەکی زۆری ئەم
ئەدەبە هەندێ یاساو دەستوور دەرهێنرابێ‌و ناوی نرابێ (ڕەوانبێژی) !
واتە ئەگەر ئەدەب نەبێ ڕەوانبێژی نابێ ! ..

لە لایەکی تریشەوە ئەدەب ڕاستەو خۆ ڕوو لە ژیانی کۆمەڵ ئەکات‌و
لەگەڵیا ئەدوێ ڕەخنەی لێ ئەگرێ ، پێی هەڵ ئەلێ ، پشت گیری
ئەکات ، پەردە لە ناگوزووری یەکالی هەڵ ئەمالێت .. بەلام ڕەوانبێژی
نە ، بەلکو لە ئاوێنەی ئەدەبەکەوە سەیری ژیان ئەکات ؛ لە پێشا ڕوو
ئەکاتە ئەدەب‌و لێکی هەڵ ئەوەشێنێ ئنجا لەو دیو ئەو ئەدەبەوە باوەڕی
خۆی بەرابەر ژیانی کۆمەلایەتی دەر ئەبڕێت ..

هەروەها ئەدەب لایەنێکی (ایجابی)و داهێنەرە ، چونکە نووسەر یا
هونەر لە خۆیەوە شتێك بەرهەم ئەهێنێ جا هۆنراوە بێ یا چیرۆك یا
ووتار .... بەلام ڕەوانبێژی وا ئەبێ (سلبی) بێت کە ڕوو لە لایەنی کزی
بەرهەمێکی ئەدەبی بکات‌و دەری بخات ؛ یا وا ئەبێ کە (ایجابی) بێت بە
هۆی ئاراستەکردنی نووسەر هێنانەوەی بۆ سەر ڕاستەڕێ‌و ڕزگارکردنی
لە هەڵدێری هەڵەو کۆسپی تێ کەوتن ..

ـ دیسان ئەدەب ئەمیش نووسەر پیشانی ئەدات ئاوێنەی بیر جیهانی
بەرەو باوەڕەکانی یەتی بۆیە شتێکی (خودی ــ ذاتی)یە بەڵام ڕەوانبێژی چونکە تا ڕادەیەك پشت بە دەستووری سنوور کێشراوو داڕێژراو ئەبەستێ شتێکی (بابەتی ــ موضوعی)یە ؛ بەڵام لەگەڵ ئەمەشا نووسەری ڕەوانبێژی ناتوانی دەست لە چەشەی تایبەتی خۆی بە تەواوی بەربدا و باوەڕی خۆی جەر پێشان ئەبدا بۆیە ڕەوانبێژی لە هونەرو زانیاری پێك هـــاتووە !.

ئەمە بوو بە تێکڕایی پەیوەندی نێوان ئەدەبو ڕەوانبێژی ؛ جا ئێستا دێینە سەر ئەوە ئاخۆ ڕەوانبێژی چۆن ؟!وە بە چ ڕێگایەکەوە ؟! وە تاچ ڕادەیەك ؟! خزمەتی ئەدەب ئەکات . وە چۆن ئەبێتە ئەلقەیەك لـە نێوانی نووسەرو خوێنەردا ؟! بۆ ئەوەی خواستو مەرامی نووسەر بـۆ خوێنەر ڕوون بکاتەوەو یانگە پێبێتە یەکتر !! (١) .

ڕەوانبێژی وەکو لە پێشـــەوە ووتمان ئەکـرێ بە سێ بەشـــەوە ڕوونبێژی ــ البیان ــ ، واتاشناسی ــ المعانی ــ ، جوانکاری ــ البدیع ــ . هەریەکە لەم سێ بەشە چەند پیشەیەکی جوانو قەشەنگ ئەگرێتەوە ؛ جاری ڕوونبێژی لێکچواندنو خوازەو خواستنو درکە ئەگرێتەوە ، ئەمانەش لە ئەدەبدا دەستکردی سۆزن ؛ سۆز پەلاماری ئـەم شـتانە ئـەداتو ئەیهانێتێ ... جا ڕوونبێژی ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە : ئاخۆ نووسەر یا هۆنەر تا چ ڕادەیەك توانیویەتی لەم بەرهەمەیدا سەرکەوتووبێ ؟! ئایا ئەو پیشەیەی دەستی بۆبردووە تەڕوپڕەو ئەچێتە دڵی خـوێنـەرەوە ؟! ئایا خاوەنی چەشەو زەوقێکی ئەدەبی نەرمو ناسکە ؟! یان نە؟! ئایا لـە نووسینو هونەر لواندا بە شێوەیەکی کوێرانە ڕێچکەی کەسانی پێش خۆی گرتووە ؟! یاخود خۆی ڕێچکەی بۆ خەڵکی تر شکاندووە ؟! ئایا ئـەو

---

(١) سارتەر ئەڵێ : نووسەر کە ئەنووسێ لەنووسینی مەبەستێکی هەیە ؛ جا ئەرکو بەیامی ڕەخنە لەوەدایە کە خوێنەر لە مەبەستی نووسەر حاڵی بکاتو بەتەواوی بۆی ڕوون بکاتەوەو لێی بکەبەنی !

پیشە رەوابیژییەی نووسینەکەی پێ گەوهەربەند کردووە لەگەڵ ئەمەو
مەلبەندو ئەو رۆژگارە ئەگونجێ کە نووسەری تیا ئەژی ؟! ئایا هیچ
رەنگیو نابەجێیی تیا بەدی ئەکرێ ؟! ئایا بەرهەمەکە چۆن دابڕابوایە
کاریگەری بە گوڕتر ئەبوو ؟! ئایا بەرهەمەکە گرەوی جوانی بردۆتەوە ؟!
یا لە زەلکاوی تێکەوتنا پێ مەلەیەتی ؟! ئەگەر جوانە ؟ شوێنی جوانییەکەو
بنەڕەتی جوانییەکە لە چیایە ؟! ئایا نووسەر توانیویەتی بە تەواوەتی
جۆشی دلی بدا بە خوێنەر ؟ یا نەیتوانیوە ؟! روونبێژی وەلامی ئەم
پرسیارانەو هەزارەها پرسیاری تری وامان بۆ ئەداتەوە ..

ئنجا ا جوانکاری ، جوانکاریش دوو جۆرە : ڕازاندنەوەی ووشەو
ڕازاندنەوەی گوزارە . هەریەکە لەم دووەش چەند پیشەیەکی ڕێکو
جوان ئەگرێتەوە وە ئەرکی جوانکاری لەوە دایە کە سەیری پارچە
ئەدەبییەکە ئەکاتو لایەنی جوانی ئەدۆزێتەوەو لێیان وورد ئەبێتەوە..
هەڵیان ئەسەنگێنێ ! ئایا نووسەر کە ئەم شتانەی هێناوە لە جۆشو خرۆش
دلیەوە هێناوینیو خۆیان جوانی خۆیان سەپاندووە ؟! یا بەزۆری
ڕایکێشاون لەم شوێنەی پەستاون ؟! ئایاجوانیو ئەفسوناوی نووسینەکە
سەرچاوەی بۆ کوێ ئەچێتەوە ؟! ئایا ئەم ووشانەی کە هاتوون هەر یەکە
لە شوێنی خۆی هاتووەو مانای پڕ بە پێستی خۆیەتی ؟! یا تەنگو لەنگەر
راوەستاوە ؟! ئایا گوزارە بەسەر ووشەکاندا زالە ؟ یا ووشەکان جلەوی
گوزارەکانیان گرتووە ؟! ئایا ووشەو گوزارەکان بە ئەندازەی یەکسر
هاتوون ؟ یا ووشەی زۆری هێناوە بۆ گوزاری کەم ؟ یاخود گوزارەیەکی
زۆری بە کەم ووشەیەك دەربڕیوە ؟ ئایا ئەم پیشە جوانکارییانەی هیناوینی
بەراستیبەرهەمەکەیان ئارایش داوە ؟ یا بە پێچەوانە دزێوو ناشیرینیان
کردووە ؟ ریزی ووشەکان ؛ ناوەکان ، راناوەکان ، کردارەکان چۆن
هاتووە ! ئایا ووشەکان ریكو تەبانو لەگەلیەك ئەحەوێنەوە ؟ یا ناکۆکیو
ناهەمواریيان لە نێوانایە ؟! ئەمەش سووچێ لەو مەیدانە پانو بەرینەی
کە تیشکی جوانکاری رۆشنی ئەکاتەوە ا..

ئنجا با بێینە سەر بەشی سێیەم : واتاشناسی ، ئەمەشیان روو ئەکاتە

ناوەرۆكو واتای پارچەكە : ئایا ئەو گوزارەی خراوەتە روو تیژە یا كولو بەتكە ؟!! ئایا مەبەستو خواستی نووسەر بەرزە یا نزمە ؟ ئایـ بە تەواوی لەو ئامانجە ئەدات كە نووسەرەكە ناویەتەوە ؟! یا رووی لـە لایەكی ترە ؟ ئایا نووسیـەكە یا جۆری دەربڕینەكە لەگەل پەیوەستی باری دوێنراو ــ مقتضى حال المخاطب ــ ئەگونجـێ یا ناگونجـێ ؟! ئایا دوو ڕستەی بە شوێن یەك هاتوو لە كوێ لەیەك دابڕێن‌جوانو نەجێ ئەبێت ؟ لە كوێ پێكەوە بنووسرێن تیروپەڕە ؟! هەریەكە لە كورت بڕیو درێژیو هەمبەری لە شوێنی خۆی هاتووە ؟! ئایا گوزارەكان شایەنی ئەو ووشانەن كە دەریان بڕیوە ؟ یان نە ؟ ئایا نووسـەر لـەچ كـلاوڕۆژنە یەكـەوە ئەڕوانێتە كۆمەلو ژیانی مرۆڤ ؟ ئایا ئەو بیرەی دەری بڕیوە پەسندە یان گەندە ؟ زنجیرەی بیرەكە چۆن هاتووە ؟! ئایا وەكـو ئاوێـكی ڕەوان لەسەرەتاوە تا كۆتایی بەبێ قۆرتو كۆسپ هاتۆتە خوارەوە ؟ یا بیرەكە پچڕ پچڕەو یەكتر ناگرێتەوە ؟! پاش‌وپێش‌كـــــردنی ناوو كردارەكان ، هەلبژاردنی ووشەكانی پرسیار چۆن كارئەكەنە ســەر مانای گشـتی بەرهەمەكە ؟! ئەمەش مشتێ لەو خەرمانە پرسیارەی واتاشناسـی ئەركـی وەلامدانەوەیان ئەگرێتە ئەســكورد ! ..

بەم جۆرە هەر بەشێكی رەوانبێژی روو لە كونجێكی ئەدەب ئەكاتو ئەپشكنێ بۆ ئەوەی هەلەو راستی ، جوانی وناشرینی ، بەرزیو نزمـی بە تەواوی دەر بكەوێو بكەوێتە بەر چاوانەوە ؛ بۆ ئەوەی نرخـــی راستەقینەی بەرهەمەكە بۆ هەموو كەسێ دەربكەوێو نووسەر یا هونەریش ئاگاداری خۆی بێتەوەو نرخو پایەی بەرهەمەكەی خۆی بزانێت !!..

# ڕەوانبێــژی چی‌یە ؟!

ئەگەر بمانەوێ مانای ڕەوانبێژی لێك بدەینەوەو ساخی بکەینەوە نابێ هەر تەنها یەك یەك جۆرە بیروباوەڕ بنووسین‌و بڵێین : ئا ئەمەیـــە ڕەوانبێژی ! چونکە هەر کەسێ بە جۆرێ تێی گەیشتووەو وەری گرتووە کە جیایە لە تێ‌گەیشتن‌و وەرگرتنی کەسانی‌تر ، بۆیە ئەمانەوێ لە پێشـا بە تێکڕایی بیروباوەڕی چەند نەتەوەیەکی وەکو : یۆنان ، ڕومان ، هیند ، فارس ، عەرەب ، کورد بەرامبەر ڕەوانبێژی بنووسین بە دوای ئەمیشەوە بیروباوەڕی هەندی نووسەرو ئەدیبی ڕۆژهەلات‌و ڕۆژاوا ئەنووسین . ڕەنگە لەم میانەدا مانای ڕەوانبێژی ئەختێ دەربکەوێ‌و بزانرێ .

(فارس) : باوەڕی وایە کە ڕەوانبێژی لێك جیا کردنەوەی (الفصل) و (الوصل)ە [1] »

(یۆنان) : ئەڵێ «ڕەوانبێژی دابەش کردنی دابەش کردنی (التقسیم) دروست‌و گونجاوە لەگەڵ هەڵبژاردنی ووشەی پوختەو جوان .. »

(ڕۆم ئەڵێ : (ڕەوانبێژی کەم‌گوێی‌یە لە شوێنی ئاشکراو درێژبڕی‌یە لە شوێنی ڕێسەدا .. »

(هیند) لای وایە : «ڕەوانبێژی بریتی‌یە لە دەربڕینی هەست‌و سۆز بە ئاسانی‌و بە ئاشکرایی : لەگەڵ هەل وەرگرتن‌و هێنا بۆ مەبەست‌کردن».

(عەرەب) ئەو باوەڕە دایە کە : «ڕەوانبێژی کورت‌بڕی بێ کەم‌و کوڕی‌و درێژبڕی بێ زیادەیە .. »

(کورد) : بۆ ئەوەی بزانین کورد چۆن ئەماشای ڕەوانبێژی کردووە؛ بە چەندی هەڵ‌گرتووە ، قسە لە قسەی ئەو کوردە ئەکەین کە ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەکردو ئەیووت : « ڕۆڵە ! قسە بێکێژە ، بیبژە ، بیوێژە . »

---

(1) ! الفصل والوصل ) باسێکی سەربەخۆیە لە (واتاشناسی)دا لە بەرگی سێ‌یەم باس‌کراوە .

واته : رۆڵه ! ئەگەر ویستت بدوێو قسه بکەی له پێشەدا وەکو چۆن گەنم ئەکەن به سەرەنداو ئەیکێڕن ، لەپاشا ئەیکەن به بێژنگ‌داو ئەیبێژن ئەو وەختە پوخت ئەبێ وکەڵکی ئەوە ئەدا که له گەرۆمەی ئاش بکرێو بکرێ به ئارد .. رۆڵه ! قسەکەی تۆش با بەم چەشنە بێت . پێش ئەوەی قسه بکەیت لێی وورد بەرەوە لە خەڵەو چەوتی ، له شتی زیادەو تارەسەن پاکژی بکەوە تا پوخته ئەبێ جا به پوختەیی دەری‌بڕە . لەو ئامۆژگاری‌یە به نرخەدا وا دەرئەکەوێ که کورد حەزی له قسەی پڕو پووچ نەکردووەو ناکا ، هەر مەراقی پوختەیی‌یە ، رەوانبێژی راستەقینەش وای ئەوی ...

جارێ تا ئێستا بیرو باوەڕی هەندێ نەتەوەمان بە تێکڕایی خستەروو ئێستا بیروڕای هەندێ له نووسەرە بە ناوبانگەکان ئەنووسین :

لاهارب ئەڵێ : « رەوانبێژی دەربڕینو گوزارشت دانەوەی راستو پەسندە له سۆزو گودازو هەستو نەستدا .. »

سۆرین ئەڵێ : «رەوانبێژی واتاو گوزارەی رێکو دروستە لە بۆتەی ووشەی لێرەشاوەدا .. »

لابرویر ئەڵێ : « رەوانبێژی نیمەتێکی نهێنی گیانی‌یە ، هێزێکی وامان تیا ئەبزوێنێ که دەسەڵاتمان بەسەر خەڵکی‌ترا بێ .. »

سێنك وای داناوە که رەوانبێژی یەزدانێکی پەنهایە له سنگی مەزدومدا ..

ئەوەش هەیە کە ئەڵێن (معاویە) لە (صحاری العبدی) پرسی رەوانبێژی چی‌یە ؟ وەڵامی دایەوە : «رەوانبێژی کورت‌بڕی‌یە . » پرسی : «ئەدی کورت بڕی چی‌یە ؟» له وەڵاما ووتی : « کورت‌بڕی ئەوەیە کە لەوەڵاما سستی نەکەیتو له دەربڕینا هەڵە نەکەیت .. » (ابن المعتز)ئەڵێ ، « رەوانبێژی بڕینی‌یە له وەرگرتنی ناتاو مەبەست بە بێ ئەوەی وشەکان درێژه بکێشن .. »

(خلیل بن احمد الفراهیدی) ئەڵێ : « رەوانبێژی ئەو شتەیە که هەر

دوو سەری هاتۆتەوە یەکترو کەچی بناوانی بێ پایانە ...

ئەوەندەو سەدەهای تریش قسەیان لێوە کردووە بەڵام بەوەندە واز دێنین ، ئەوەش بزانین باشە کە کۆنینەکان بڕوایان وابووە ڕەوانبێژی پەیکەرێکی خواوەندی‌یە ئەدوێ‌و قەفی زنجیری زێڕینی لێیان بەخشی لە دەم دێتە دەرەوەو ڕاستەوخۆ بۆ گوێگر ئەچێ !!

باوەڕێکی‌تر هەیە کە مانای ڕەوانبێژی بەم تەرزە لێك ئەداتەوە : « کە عیبارەتێکی دلگیری ڕەوانت بەرچاو ئەکەوێ لەبەر خۆشی‌و ڕەوانی تۆش لات وا ئەبێ کە وەکو ئەتوانی بڵێت کەچی دێتە سەر ووتنەکەی پێت ناکرێ ..» یاخود بە جۆرێکی‌تر تەماشای ئەکەن : پڕ بە پڕی مەعنای جوانە لە بۆ ووشەی بێ گرێ‌و قۆرت »[1] .

لە ڕاستی‌دا بۆ ئەوەی قسەیەك یا نووسینێك بکەوێتە بەر بلێسەی گەشی ڕەوانبێژی پێویستە ڕەوانی‌یەکەی لە دوولاوە بێت ، لە لایێ ووشەو لە لایێ گوزارە ، یا لەبارەی ڕوخسارو لەبارەی ناوەڕۆك ، چونکە ئەگەر جوانی‌و ڕەوانی تەنها لە گوزارەدابو ووشەکان پچڕ پچڕو شێوار بوون دڵ نەفرەتی لێ ئەکات‌و فرێی ئەدات .. خۆ ئەگەر ووشەکان ڕێك‌و پوختە بن‌و ماناو ناوەڕۆکەکەی پووچەل بێت دیسان دڵ جێگای ناکاتەوەو نەفرەتی لێ‌ئەکات .

یا وەکو هەندێ ئەڵێن نووسین وەکو گیاندار وایە ، ووشە لەش‌و گوزارە‌گیانی‌یەتی دیارە لەش‌و گیایش بەبێ یەکتر هەڵناکەن چونکە ئەگەر شیرازەیان لێك دابچڕێ گیان ئەچێتە هەناسەیەکی یەزدانی‌و لەشیش ئەبێ بە تەرمێکی ساردو سڕی بێ هەست .. بەم جۆرە ووشەو گوزارە بوونیان بە بوونی یەکترەوە لکاوە ، ئەگەر ووشە لەبێ گوزارە لە ناخەوە دەربکێشێ ئەو گوزارەیە هەر لە دولیای لێێنی دەروونا پەنگ ئەخواتەوەو هەستی پێ‌ناکرێ ، دیسان کە گوزارە بەبێ گیایێك بکا بەبەر ووشەدا ، ووشە ئەبێ بە قەپێلکێکی بێ کاکڵ‌و کەلکی نابێ .. بە کورتی ئەبێ گوزارە

---

[1] ئەم باوەڕی پێشووم لە (مێژووی ئەدەبی کوردی ــ سجادی ــ) وەرگرتووە

پڕ بە پێستی وشەیێت ، کە واش بوو وتەکان زۆربەی زۆری ئەوزارەبەستەکە دەرئەهێنن و دەری ئەبڕن ، گوزارەش کەولی بەتاڵی وشەکان پڕ ئەکاتەوە .. ئەو کاتەی وشەو گوزارە دەست لە مل و شان بە شان دێن هەست و سۆزی قسەکەر وەکو ئاوی ڕەوان یا وەکو کزەبای بەیان هەڵ ئەکشێن و هەر ئەکشێن تا ئەگاتە قووڵایی دڵی گوێگرو لەوێوە ئەگیرسێتەوە، کە گیرسایەوە وە لەبێ بوەستێ ، بەڵکو ئەتەقێتەوەو ئەتەقێتەوە لە خوێن و خێچکاوی دەمارەکانیا گینگلە ئەدا ، هەر لە بڕەودا ئەبێ تا هەر سێڵێکی لەشی ئەکا بە کوورە ئاگرێکی پڕ جۆشەوە ؛ وە بە تەواوی گوێگر ڕائەکێشێ بۆ ئەوەی بکەوێتە سەر هەستی قسەکەرو ڕوو لە ڕووگەی ئەو بکا ، کەواتە هاتینە سەر ئەوە : هەر قسەیەك کە ئەکرێ یا هەر نووسینێك کە ئەنووسرێ ئەو کاتە ئەکەوێتە ژێر ئاڵای ڕەوانبێژی و دەنگ ئەداتەوە کە بچێتە دڵی گوێگرو گوێگر بخاتە سەر هەست سۆزێکەوە کە هی قسەکەرە. ئەگەر وانەبێ ڕەوان لێیە ، لە جۆش و خرۆشێکی گەرمەوە حەڵنەقوڵاوە .

ئێستاش دێینە سەر بەشی یەکەم لە ڕەوانبێژی کە ڕوونبێژی
ـ البیان ـ ..

# روونبێژی ـ البیان ـ

بەر لەوەی کە هەست دەربڕێ‌و بکەوێتە سەر کاغەزەوە ، لە دڵو دەروونی مەردوما کڕ کەوتووە ، یا لە مێشکیا لوول ئەخوا ، رووبێژی باسێکی زۆر فراوانە ئەو هەموو شتانە ئەگرێتەوە کە پەردە لە رووی گوزارە لائەدەن‌و ئەیخەنە بەرچاوەوە ، یا بیروباوەڕێك ئەگرن‌و ئەیخەنە رووەوە تا گوێگر یا خوێنەر بتوانێ بگاتە بنج‌و بناوانی مەبەستەکەو تێی بگات .. رونبێژی سەیداتێکی پان‌و بەرینە قسەرو گوێگر : یا نووسەرو خوێنەری تیا ئەسوورێتەوە ، یەکەمیان سۆزی تواوەی دڵی خۆی ئەخاتە دڵی دووەمیان‌و لە سەرچاوەی بیروباوەڕی خۆی ئاوی دڵی ئەدات، وە دووەم دەم ئەبێتە شیلەی بیری یەکەم چوڕ چوڕ هەڵی ئەمژێ ۰ جا ئەم گۆڕینەوەی سۆزو گودازە ، یا ئەو راگەیاندنی بیرو رایە بە هۆی هەر شتێکەوە بێت ، ئەو شتە رووبێژی‌یە !

بێ گومان هەست یا گوزارە گەلێ گەلێ جیایە لەگەڵ ئەو ئەداتەی کە دەری ئەبڕێ چونکە گوزارە دەریایەکی بێ پایانەو خەستی لەێنی دوورە دەستە ، ئەوەندەی پیاو خۆی بۆ هەڵبکوتێ‌و بیەوێ دەربڕێ هەر بەشێکی یەکجار زۆر کەمی پێ دەر بڕێ‌و بەس ۰ بەڵام ئەو شتەی کە لوێچ لوێچ گوزارەکە هەڵدێنجێ‌و پێشانی ئەدا ئەوەندە کەمن پەنجەی یەك دەست بڕیان ئەژمێردرێت .. ئەوانیش ئەمانەن .

١ ــ زمان ــ ووشە ــ اللفظ

٢ ــ نووسین ــ الخـط ــ

٣ ــ هێما ــ الاشارة ــ

٤ ــ زیوار ــ دۆخ ــ الحال ــ

٥ ــ ئەژێر ــ العقد ــ

به باسـەکەمانەوە نییە ! بۆیە لە سەر ڕۆشتیان زیادەیە ، هەر تەنهـا تـە لە دووەکەی بەرایی ئەکەین کە (زمان)و (نووسینە) . ئـەم دووەش ئامرازی هەرە گەورەی دەربڕینن ! ..

زمــان :

گەیشتوون، تا کاتەی نووسین کەوتۆتە ناوەوە وە لە بارەی زمانو گفتوگو ئادەمزاد ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ هەر بە قسـە کـردن لەیـەك کردنەوە ووتوویانە :ـ

گیان کۆلەگەی لەشەو زانست کۆلەگەی گیانەو روونبێژی کۆلەگەی زانسـتە .. »هەروەهـا ووتوویانـە : « هـۆش ـ العقل ـ پێشەوای گیانە ، زانستیش پێشەوای هۆشەو روونبێژیش وەرگێڕی زانستە ..» هەروەها مامۆستا حەمەکەریم هەورامی ئەڵـێ : « بوونی زمـان هـۆی کۆمەڵایەتییە ، کۆمەڵایەتیش یەکەم قۆناغی شارستانییە ، زمانیش بناغەی کۆمەڵایەتییە ..» [1] یاخود «زمان بە شێوەیەکی گشتی یەکەم خۆمالـە کـە ئادەمـزاد لە هەموو گیـان لەبەرێکی تر جیا ئەکاتەوە ، لەبـەر ئەوە مرۆڤ لە کۆنەوە بە ـ بوویەکی زیندووی وێژەر ناسراوە » [2] بەم جۆرە زمان ئەبێ بە یەکەم نیشانە بۆ جیا کردنەوەی ئادەمزاد لە هەمـوو گیانداریکی تر .

نووسـین :

لە پاش زمان نووسین دێت بۆ دەربڕینو گواستنەوەی هەسـتو سۆز لە دڵی نووسەر بۆ لووکی پێنووسەکەیو لەوێوە بۆ سەرپشتی پاکژی کاغەزو لەوێشەوە بە هۆی تیشکەوە بۆ چاوی خوێنەرو لە چاوەو بـۆ مێشكو دڵو بۆ هەموو ئەندامێکی تر .. لە بارەی نووسینو خوێندنـە ـ چونکە شتێ نووسرابێ ئەخوێنرێتەوە ، وە شتێ بخوێنرێتەوە دیارە لە پێشا نووسراوە ـ گەلێ قسەکراوە .. لە کوردەواری خۆمان ئەڵێن :

---

(1)(2) ( سایکۆلۆجی‌یەتی خوێندنەوە )

ز دوور [illegible] بۆ ئێوزە [illegible] خوێندن پێتی [illegible]
دلزار ئەڵێ :

لاوی کورد بخوێنــە خوێندن مەرهەمە بــۆ زامــی گــەل
تیشــکی زانینــە ئــەدا ڕۆشــن بــە ئەستێرەی ئەمەل

احمد مختار بەگی جاف ئەڵێ :ــ

بخوێنن چونکە خوێنــدن بۆ دیفاعــی تیغــی دوژمنتــان
هەموو نــانو ســەعاتی عەینــی قەلغــانو ســوپەرتانــە

هەر وەها وتراوە

ئیــان فیدای دەستو قەلەم بێ ئەسپو زینم بۆ چــی‌یە ؟
تــا قــەلەم هیمــەت بکــا برنــەو کرێنم بۆ چــی‌یە ؟

نووسین زۆر گرنگترو بەردەوامترە لە قــەکردن ، قــە تەنهــا بــە دەوروبەری شتی نزیکو بەردەم ئەسووڕێتەوە ، ئاراســتەی کەســێ ئەکرێ کە بەرامبەرتە یا گەلێ لێتەوە دوور نی‌یە ، کەوابوو قـــە لـە نــاوچەیــەکــی تەنــگو تریــــــکا ئەســـووڕێتـــەوە ، هەگـــە ئــەوەنــدە پەســــــند بکــرێ کــە بێ بــە پەنــدو بکــەوێتە ناو دڵو سەر زارانەوەو پارێزرێ ئەگینا خۆی لەبەر ڕەوڕەوی ڕۆژگا ناگرێ ، بەڵام ئەو شتەی ئەنووسرێ بۆ هەموو کاتو شوێنو بۆ هەموو کەسێ ئەبێت ، نووسەرێك کە ئێستا لە چەرخی بیستەم شتێك بۆ نــەوەی ئێستا ئەنووسێ ، بۆی هەیە ئەو نووسینە ئەوەندە بە هێزو تەوژم بێت کە بەتێتەوەو دەنگی بۆ گەلێ ناوچەو شوێنیتر بڕواو بەرچاوی بێجگە لــە کوردیش بکەوێ ،هەروەکو بۆی هەیەنووسینەکە خۆی بۆسەدەو نەوەکانی داهاتوو هەر بهێڵێتەوەو تا دونیا دونیا بێ هەر بمینێ ! بەڵام ئەوەندە هەیە کە پیاو ڕوو بە ڕووی یەکێك ئەبێ یا لە کۆڕێ دا ئەنیشێ ــ ئەوە ناڵێم ئەگەر کۆڕی خامۆشی پڕ ڕەمزی پیتۆلان بێت ــ ئەگینا هەر قــە برەوی ئەبێو نووسین سوودێکی وا نادا بە دەستەوە .. یەکێ کە ئەیەوێ بیرو بارەڕێك یا هەستو سۆزێك دەربڕێ ــ بە هۆی قـــەکردن بێــت یــا

نووسین [illegible]
زەینی‌یەوە ، ئەنجا بەرگی ووشەی بە بەرا ئەبڕێ ، کە دەریشی ئەبڕێ
ئەبخاتە پێستی هونەرێکی روونبێژی‌یەوە ، روونبێژیش ئەم چەند پیشەو
هونەرە جوانو نەشەنگە ئەگرێتەوە

١ ــ لێکچوانــدن ــ التشبیه ــ

٢ ــ خــوازە ــ المجــاز ــ

أ ــ خوازەی زمانی : ئەوەش دوو لقە :

- خواســـتن ب
- خوازەی بەرەڵلا

ب ــ خوازەی ژیری ــ المجاز العقلی ــ

٣ ــ درکە ــ الکنایــة •

روونبێژی کە ئەم هەموو شتانە ئەگرێتەوە ، هەریەکــەیان پلــەو ئەندازەی خۆی هەیە لە رۆشنیو ئاشکرایی‌دا ، وە هەر یەکەیان جۆرە کار تێ‌کردنێکی تایبەتی هەیــە •

پەسند کردنی یەکێ لەم پیشە روونبێژی‌یانە زیاتر لەوانــەی تــر ئەچێتەوە سەر چەشەی نووسـەر یا قســەکەر ــ ئەمــە بە گوێــرەی دەربڕین ــ وە ئەچێتەوە سەر چەشەی گوێگر یا خوێنەر ــ ئەمەش بــە گوێرەی وەرگرتن ــ وە هەرگیز ناتوانرێ یەکی لەمانە بە زۆرە ملــی بــەپێنرێ چونکە هەر شوێنێك هونەرێکی تایبەتی گەرەکە !

# لێکچواندن

**مانای لێکچواندن**

ئەگەر بتەوێ سیفەتێك بە لای کەسێکەوە یا شتێکەوە ساخ بکەیتەوە لەگەڵ پێشاندانی هوشەکاریو ئاشکرا کردنی ئەو سیفەتە ، ئەچی بە شوێن شتێکی ترەوە ئەگەڕێی کە ئەو سیفەتەی زۆر بە ئاشکرایی تیا بدرەوشێتەوە ، جا وێچون ــ مائلة ــێك لە نێوان هەر دوو شتەکەدا ئەبەستی بۆ روون کردنەوەو دەرخستنی سیفەتەکە ، کەوابوو لێکچواندن بەستنو پەیداکردنی وێچوونێکە لە نێوانی دووشتا بە هۆی هاوبەش بوونیان لە یەك سیفەتا یا زیاتر بۆ مەبەستێك یا چەند مەبەستێکی دیار .. گۆران ئەڵێ :

نوێژ بە تاڵ ئەبێ جەماعەت بڵاو
چەند پیرێك ئەبن بە خلتەی لافاو

بێ گومان لەگەڵ زرکەی مەلا بانگدانا لە هەموو لایەکەوە خەلکی بەسەر مزگەوتا دائەڕژێن ، وەکو چۆن بەستو زێ لە هەموو لایەکەوە لە دەریا ئەکەنەوە .. تا نوێژ ئەکرێ ئنجا وەك لافاو شەپۆلی ئەم خەلکە ئەڕواو مزگەوت جێ دێڵێ ، ئەوەی ئەمێنێتەوە چەند پیاوێکی پیرە .. جا (گۆران) دیمەنی ئەم پیاوە پیرانەی لە پاش لافاوی دەرچوونی خەلك لە مزگەوت بە جێ ئەمێنن بەو خلتو خاڵەی چواندووە کە پاش لافاو هەڵسان ونیشتنەوە لە جێ دەوسی لافاوەکە ئەمێننەوە .!

لێکچواندن لە بنەڕەتەوە لەسەر ئەوە هاتووە : کەم بە زۆر ، ناتەواوی بە تەواو ، نزم بە بەرز ، بچووك بە گەورە ، بێ باکی بە چالاکی ، ... بگەیەنرێ ئەمەشیان لە پیا هەڵدانا ئەبێ .. طاهر بەگی جاف ئەڵێ :ــ

لێوت کە وەکو لەعلی درەخشانە بە ئاڵی
گەنجووری نیگەهبانی دەهانو دەمی تەنگە

لێرەدا کە ئێوەی ماری کردووە بە لەعلی درەخشان لە ئاڵی‌دا دیـارە لێو بە چاو لەغلەوە هیچ لێ‌نیە ، بەڵام لە لەو وەکو ئەبینی پێ... ...
لە رووی پیــا هەڵدانەوەیــە .

خۆ ئەگەر باس باسی خوسپ و داشۆرین بێت بە زەبری سروشتی باسەکەوە ئەبێ لێکچواندنەکە رێکچەیەکی پێچەوانە بگرێت واتە ئەبێ گەورە بە گچکە ، بەرز بە نزم ، باش بە خــراپ ، رەنــد بە گەند ... بچوێنرێ ، وەکو ئەوەی شێخ رەزا رایەلی ئاشنایەتی لەگەڵ مامی ئەپسێ و شالاوی بۆ ئەبات و بە جنێوی زل زل دای ئەگرێ لە کاتێکا کە ئەلێ :

رەنگی کەر ، دەنگی بەقەر ، هەیئەتی سەگ ، خووی چەقەل .

کە مامی بەم شتانە ئەچوێنێ : بە کەر لە رەنگی‌دا ، بە مانگــا لە دەنگی‌دا ، بە سەگ لە شێوەی دا ؛ بە چەقەل لە فرۆفێلا هەلبــەت بــۆ شــکاندنیەتــی !

## لێکچواندن دیار ( ظاهرة )یکی سروشتی‌یە

ئەگەر نەختێ هەست لە دەوروبەری خۆمانا رابگرین ، گوێ بۆ گفت ولفتی هاوزمانەکانمان شل بکەین بە ئاشکرا بۆمان دەر ئەکەوێ کــــە لێکچواندن وەکو فرفرۆك لە ناو گفتوگۆکردنمانا هەڵەرچەرخێ بە بــێ ئەوەی هەر هەستیشی پێ‌بکەین . لێکچواندن وەنەبێ تایبەتی بێت بە هیچ نەتەوەو هۆزو عێلێکەوە بەلکو بەهرەیەکی گشتی‌و دیارێکی سروشتی‌یە ، هەر بە زگماکی‌یەوە هەموو دلێك بۆی ئەچێ‌و بە رشتنەی ئەوەوە گڕی خۆی دائەمرکێنێتەوەو نەشئەیەك پەیدا ئەکا ..

ئەم رەمەکی مەردومەی کە فریان بە سەر خوێندەواری‌یەوە نی‌یە بە بێ ئازارو تکلف گەلێ لێکچواندلی پەسندو جوان بەکار ئەهێنن ، وەکو لێکچواندنی قسەی خۆش بە هەنگوین ، لە شیرینی‌دا ، شتی نەرم‌و لووس بە ئارمووش ، شتی گەرم‌و گوڕ بە ئاگر ، شتی سپی‌یا ساردو سڕ بە بەفر !!

نووسەران و [illegible] دەستەی [illegible] لەگەڵا لێکچواندنا [illegible]
ئەگەنەوە یەکتر وەکو : لێکچواندنی پیاوی ئازاو نەترس بە شێر ، رووی
جوان بە مانگی چواردە ، بەژنی بەرز بە توولە ئەمام ۰ بەڵام پلەکە لەسەر
ئــەوە ناکەوێ کە لێکچواندنی خەڵکەکە زوورو دەرە ، بە پێچوانــەی
لێکچواندنی نووســەرو شارەزاکان کە جــوان دائــەڕژێو پوختە تێك
هەڵئەکێشرێ ، تەڕو پڕو پڕشنگ تیژە ، نەرم شلو روح ئەنگیــزە ؛
چونکە بەرهەمی هۆشێکی فراوانو دەست چنی خەیاڵێکی بێپایــانو
داڕژاوی چەشـەیەکی لە خەرمك دراوە ۰ ئەتوانین بڵێین لێکچواندن جۆرە
پێوانێکە ، پێوانیش لە ناوچەی هۆشو ئیدراکەوە هەڵئەقوڵێ وەکو پێك
گرتنو بەراوردکردن کە دوو سیفەتی ئادەمزادی سەرەتایین ، ئەمەشیان
سیفەتێکی زۆر کۆنەو لە خوێنی دەمارەکانی هەموو کەسێکا تواوەتەوە ؛
بگرە منداڵێکی ساوای بەر مەمکان پەی بە پەیوەندی نێوان شتی لــە
یەكچوو ئەبات وەکو چۆنمەمەی دەستکرد ئەگرێتە دەمو ئەیمژێ !
چونکە دیارە پەیوەندیو وێچوونێکی هەست پێکردووە لە نێوان مەمەی
دەستکردو مەمکی راستەقینەی بەر بەرۆکی دایکی ۰

ئەم نموونەیە ئەبێ بە بەڵگەیەکی رۆناكو ئەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕە
پتەوە کە نەك هەر کورد بەڵکو ئادەمزاد بە تێکڕایی لە شلکەی ئێستانو
دارە دارەی گاگۆڵان لێکچواندنیان تێکەڵ خوێنو خیچکاوەو بۆتە ماکی
زکماکی سەر تەختی بێ گەردی دڵیانەوە ۰

## بنــەڕەتەکانی لێکچوانــدن

لێکچواندن شتێکی سادەو ساکار نییە ، بگرە کردەوەیەکی قووڵو
ئاوێتەو تێك داڕژاوە ، لەسەر چەند بنەڕەتو رەگەزێکەوە سەری هەڵداوە،
بنەڕەتەکانیش ئەمانەن :ــ

١ ــ ئەبێ شتێك هەبێ ، ئەو شتەش سیفەتێکی تیا بێ ، ئەو سیفەتــەش
پێویست بە ئاشکراکردنو داگرتن ــ تاکید ــ بێت ، جا بۆ ئەوەی

ئەم سیفەتەی بە سەردا ساغ بکەینەوە دەبێ بە شتێکی تری ئەچوێنین.
کە هەمان سیفەتی تیابێ .. ئەم شتەش کە خاوەنی سیفەتەکەیە پێی
ئەووترێ (لێچوو ـ المشبه) .

٢ ـ ئەبێ شتێکی تریش لەولاوە هەبێت تا سیفەتی (لێچوو)ی پێ
ساغ بکەینەوەو روون بکەینەوە ، بۆیە ئەبێ ئەمەشیان هەمان سیفەتی
تیابێ بەڵام بە جۆرێکی وا گەلێ لەو گەش و پرشنگدارتر بێ ،
ئەوەشیان پێی ئەووترێ (لەوچوو ـ المشبه به) .. ئنجا (لێچوو) و
(لەوچوو)بە یەکەوە ئەبەسترێنو پێك ئەهوێنرێن کە واش کرا سیفەتی
کزی (لێچوو) لە ئاوێنەی سیفەتی گەشی (لەوچوو) دەر ئەکەوێ ..

٣ ـ ووتمان (لێچوو ـ لەوچوو) کە دوو لای لێکچواندن ئەبێ لە
سیفەتێکا یەك بگرنەوە یا پەیوەندی‌یەکیان لە نێوانیدا هەبێت جا ئەو
سیفەتە یا ئەو پەیوەندی‌یە کە هەر دوو لای لێکچواندن ئەگەیەنێتە
یەکتر پێی ئەووترێ (لێکچوون ـ وجه الشبه) .

٤ ـ جگە لە ( لێچوو ـ لەوچوو ـ لێکچوون ) زۆر جار ووشەیەك
ئەهێنرێ وەکو ئەلقەیەك سیفەتو پەیوەندی ئەم سەرو ئەو سەر بە
یەکەوە ئەبەستێ ئەم ووشەیەش بە (ئەوزار ـ أداة ) ناو ئەبرێ ..
کورتەی ئەم باسە دێتە سەر ئەوە کە لێکچواندن چوار بنەڕەتی هەیە
یەکەم : لێچوو ، دووەم : لەوچوو ، کە پێیان ئەووترێ : (دوولای
لێکچواندن ـ طرفا التشبيه) ، سێیەم : لێکچوون، چوارەم : ئەوزار..

نموونەیەك :

هەردی ئەڵێ :

ئەو گەردنە بێ گەردە کە وەك تەختی بلوورە
ئەو لێوە کە وەك خونچە تەڕو ناسك سوورە

لە نیوەی یەکەم (هەردی) گەردنی بێ گەردی دڵخوازی کردووە بە
تەختی بلوور لە ساڤیو بێ گەردی‌دا . (گەردن) لێچووە ، (تەختی بلوور)

لەوچووە ، پەیوەندی نێوانیان ساف‌و بە نەزاکەتی‌یە بۆ بە لێکچوون .
(وەك) ئەوزاری لێکچواندنە .. یاخود زیاتر روونی بکەینەوە ، (هەردێ)
چاوی بە گەردنی بۆ گەردی یارەکەی کەوتووە پێیویە کە چەند ناسك‌و
پاکژە جا ویستوویەتی من‌و تۆش لەم هەستە ئاگادار بکات‌و ئەم مانایە بۆ
گەردنەکە بسەلێنێ .. گەلێ گەڕاوە بە دوای شتێکی پاکژو خاوێنا تا
تەختی بلووری دۆزیوەتەوە ، جا گەردنی بەم تەختە بلوورە چواندووە
لە پاکژی‌دا .

له نیوەی دووەمیشا لێکچواندنێکی تر هەیە . لێوی تەڕو ناسکی
یاری بە خونچە چواندووە . (لێو) لێ‌چووە ، (خونچە لەوچووە ؛
(تەڕی‌و سووری‌و ناسکی هەر دوولا) لێکچوونە . (وەك) ئەوزارە .

## وورد بوونەوەیەك لە بنەڕەتەکانی لێکچواندن

**لێ‌چوو ، لەوچوو**

ئەم دووەیان کە دوو ستوونی پتەوی‌و لێکچواندنیان لەسەر
راوەستێ پێیان ئەووترێ «دوولای لێکچواندن»ئەو دوو لایەش کە
بنج‌و بناغەی لێکچواندنن پێویستە

١ ــ یا « لە راستەقینەو خودا یەك بگرنەوەو لە خاسەوێژا لێك جیاینەوە»

٢ ــ یا « هەردووکیان لە خاسەوێژا بچنەوە سەر یەك رەگەز بەڵام لە
راستەقینەو خودا هەر یەکە شتێك بێت .

چونکە هەر لێکچواندنێك پێویستی بەوە هەیە کە (دوولا) کەی لە
هەندێ سە جیاوازو لە برێ لا وەکو یەك بن‌و لەیەك ئاوێنە دەربکەون ،
چونکە هاوبەش‌بوونی هەر دوولا لە هەموو بارەیەکەوە ئەوە ئەدا بە
دەستەوە کە هەردووکیان یەك شتن‌و دوو ووشە یا دوو واتە دەریان ئەبڕێ
هەروەکو جیاواز بوونی هەردووکیان لە گشت سەرێکەوە مانای وایە
شتێ نامێنێ کە یانگەیەنێ یەکترو لێکچواندنەکە دروست بکات ..

پەڵاو پوول نیازیران گەمرین پڕ خەیالان
رووم‌ـەت پەڕەی گوڵ باڵا شمشالان
ـ سەلام ـ

کە لێرەدا (سەلام) روومەتی یار بە پەڕەی گوڵ ئەچوێنێ . (رووم‌ەت)و (پەڕەی گوڵ) ئەبێ بە دوولای لێکچواندنەکە، وە (لێکچوون) لێرەدا سووری‌و تەڕی‌و ناسکی‌یە نەك شتێکی‌تر ! وەکو بچووکی ، یا بێ گیانی یا ..

هەروەها کە ئەڵێی : «فلان وەکو شێر وایە» مەبەست چاوقایی‌و نەترسی‌یە نەك چوارپەلداری ، یا تووکنی ، یابۆنی ناخۆشی ناو دەمی .. یاکێوی‌یانی :

کەواتە راستە ئەبێ دوو لای لێکچواندن لە هەندێ لا جیاوازو لە هەندێ لا وەکویەك وابن .. بۆ نموونە .. کە تەماشای ئەم هەموو خەلکەی سەر رووی زەمین ئەکەی تێکرا یەك کەلەخ‌و هەندام‌و سەرو سەکوتیان هەیە ، تێك هەلکشانی جومگەو ئێسقان‌و بەشەکانی لەشی هەموویان وەکو یەکە ، کەچی هەریەکە لە بۆتەیەك‌و هەر یەکە بە رەنگ‌و بچێك داڕێژراوە ، لە سەرەتای پەیدابوونی ئادەمزادەوە تا ئەمڕو وتا دونیاش ماوە دووکەس وا پەیدا نەبووەو نابێ کە کت‌ومت وەکو یەك بێ‌و موویەك جیاوازی‌یان نەبێت‌و تێك بزربین ، وەکو ئەمە پەیدا نابێ ئەوەش هەر دەست ناکەوێ کە دوو کەس بە تەواوی وە لە هەموو شتێکەوە جیاوازبن چونکە هەر هیچ نەبێ رواڵەتی گشتی دەرەوەیان وەکو یەکە ، وەك ئەوەی‌هەر یەك دووچاو ، دوو دەست ، دوو پێ ، یەك سەر ، یەك دەم ، یەك لووتیان هەیە ..

کەواتە دووکەس لە ئادەمزادا هاوبەشن لە بنەڕەت‌و رەچەلەك‌و راستەقینەدا کە بریتی‌یە لە بوونی هەر دوولا بەو گیاندارە پێ‌ژەندو بالا راست‌و هۆشمەندەی پێی ئەووترێ « ئادەمزاد » ، لە پاڵ ئەمەشەوە لەگەڵێ خاسەوێژا یەك ناگرنەوە وەکو ئەوەی یەکێ کورت‌و ئەوەی‌تر درێژ،

[illegible] چاو رەش بێت ، [illegible] دیارە ئەم [illegible] هەر
کە ئەڵێ بۆ لێکچواندنی دوو شت ئەبێ هەر دووکیان «لە راستەقینەو خودا
یەك بگرنەوە و لە خاسەوێژا لێك جیابینەوە» .

ئەمجارە با بۆ نموونە ئادەمزادێكو ئەسپێك وەربگرین و لێیان
وورد بینەوە ئەبینین لە رەگەزو راستەقینەدا لە یەك دوورن
بەڵام دوور مەبینە لە خاسەوێژێکا یەك بگرنەوە . وەك ئەوەی لە بەزری‌دا
وەکو یەکێبن ، یا چاویان وێك بچێ یا ... جا ئادەمزادو ئەسپ لە رەگەزو
راستەقینەدا ئاسانو ریسمان لە یەك دوورن بەڵام لە خاسەوێژێکا کە
بەزری‌یە ـ بڵێین ـ رەنگە ئادەمزادێكو ئەسپێك لە دەماری مل لە یەکتر
نزیکبن ، کەواتە دیارە قسەکەی‌تریش سەری گرت کە ئەڵێ بۆ لێکچواندنی
دوو شت پێویستە « هەر دووکیان لە خاسەوێژا بچنەوە سەر یەك بەڵام
لە راستەقینەو خودا هەر یەکە شتێك بێت . »

مایەوە سەر ئەوە : ئایا کامەیان جوانترو پەسندترە لێچوو و
لەوچوو گەلێ لەیەك بچن‌و لە گەلێ لاوە هاوبەشبن ؟! یا ئەوەتە گەلێ
گەلێ لە یەك دوور بن‌و لە کەم لاوە لەیەك بچن ؟! بە باوەڕی من تا ئەم
لاو ئەو لای لێکچواندن لە یەك دوور بن‌و جیاوازی‌یان زیاتر بێت
لێکچواندنەکە جوانترو سەرنج راکێشەرتر ئەبێت بەو مەرجەی
(لێکچوون)ەکە بە تەواوی دیاربێ‌و هەر دوو لا بگرێتەوە ؛ چونکە ئەو
جۆرە شتە ئەوەمان پیشان ئەدا کە هۆنەر یا نووسەر هەستی لە هەستی
خەڵکی سادە ناسکترەو خەیاڵی باشتر قەڵبەزە ئەداو دووتر ئەڕوا ،
سەرنجی ووردو تیژترە ، بۆیە توانیویەتی شتی وابێنێ کە هەموو کەسێ لە
باری ئاسایی‌دا بە ئاسانی نەتوانێ بەدی بکات بە پێچەوانەی ئەمەشەوە
ئەو نووسەرەی دووشتی باوو لە یەك نزیك بە یەك ئەچوێنێ هیچ
هونەرێکی وا نانوێنێ کە شایەنی سەرنج راکێشان بێت .

بەسرانەوەی هەردوولا :

ئەوەیە کە لە کاتی لێکچواندنەکەدا هەر دوولا یا هەر یەکێکیان بە

مەرجێك یا چەند مەرجێکەوە ببەسترێ ، ئەمەشیان - وائەبێ - تەنها (لێچوو) بە مەرجێك یا پەیوەندییەك ببەسترێ وەکو :

ژیــان بەبێ یـار وەکــو زەریایـــــە
ئـەو ژینـە خۆشــە کــە یــاری تیایــە
بۆیـە نــامەوێ بــە بـێ یــار بژیــم
چونـــکە معلومــە هــەر خـوا تەنیایــە

- هەلمەت -

لێرەدا ژیانی کردووە بە دەریا ، (ژیان) لێچووە ، (دەریا) لەچووە ، (وەکو) ئەوزارە .. جا کە ئەم لێکچواندنە ئەکا وا نەبێ مەبەستی لــە لێچوو کە ژیانە هەموو ژیانێك بێت ، بەڵکو مەبەستی جۆرە ژیانێکــی تایبەتییە ، مەبەستی ئەو ژیانەیە کە شەوقی روخساری یاری تیا ونــە ؛ تەنها ئەو جۆرە ژیانە وەکو زەریا وایە ، کەواتە لێرە مەرجێك بۆ ئەو ژیانە پەیدا بوو کە وەك زەریایە ئەویش بێ یارییە ..

یاخود وائەبێ کە (لەوچوو) پابەندی مەرجێك بێت و بە دەستوورێك شەتەك بــدرێ وەکو

چـــاوە وەك لێـــزمەی بارانــی بەهــــار
فرمێـــسکی خوێنیت بــۆ پیــا دێتــە خـــوار
گریـــان کـــردەوەی بــێ دەســـەڵاتــە
بـــێ دەســـەڵاتــان ئەرژن لــە ژێــر بــار
- بلـە -

مامۆستا فرمێسکی خوێنینی کردووە بە باران ، (فرمێــسك) لێچوو .. (لیزمەی باران) لەوچوو ، بەڵام فرمێسکی نەکردووە بە هەموو بارانێك، بەڵکو کردوویە بە جۆرە بارانێکی تایبەتی کە بارانی بە گــوڕ دارژاوی

گەوارەی بەهارە . کەواتە (لەوچوو) لێرە کە بارانە مەرجێکی بایەتی بارانی بەهاربێت !

وەکو ئەگونجێ تاکە تاکی لێچوو و لەوچوو بە شتێك بەند بکرێن ئاواش ئەلوێ کە هەردووکیان پێکەوە بە مەرجێك یا چەند مەرجێك بەسرێنەوە

کە خالی بێت دلی عاشق لە بادەو حبی معشوقی
بە خۆرایێست نەوێ چاکە وەکو شووشەی شکاو وایە
ـ حەریق ـ

--

لێکچواندنی (دلی عاشقی) کردووە بە (شووشەی شکاو) . کە نەختێ لەم لێکچواندنە وورد ئەبینەوە ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم لێکچواندنە مۆرکێکی گشتی پێوە نی یە واتە دلی هەموو عاشقێك وەکو هەموو شووشەیەك وانی یە ! بەلکو دلی ئەو عاشقانەی کردۆتە لێچوو کە لە بادەو خۆشەویستی خۆشەویست خالی یە کەواتە لێچوو لێرە مەرجێکی بەسەر سەپاوە کە خالی بوونیەتی لە خۆشەویستی . وە کاتێ تەماشای (لەوچوو)ش ئەکەین کەشووشەیە ، لەویش مەبەستی هەموو شووشەیەك نی یە بەلکو مەرجی شکانیشی هێناوەتە سەر ، واتە : نەك هەموو دلێ ، بەلکو تەنها ئەو دلەی لە خۆشەویستی بەتالە وەکو شووشە وایە بەلام وەکو شووشەی شکاو ! نەك شووشەی ساغ .

لێکچوون :

ئەو کاتەی نووسەر یا هۆنەر دوو شت ئەکا بە یەك و لێکیان ئەچوێنێ ، ئەبێ گوزارە یەك یا پەیوەندی یەك یا خاسەوێژێکی تایەتی هەبێ ئەم لاو ئەو لا بگەیەنێتە یەکترو ئاشنایەتیان لەنێوان پەیدا بکات ، جا ئەو گوزارەیە یا ئەو پەیوەندی یە یا ئەو خاسەوێژە ئەبێ بە بنەی بناغەو لێکچواندنەکەی لەسەر دائەمەزرێ !

بەلێ ! ووتمان نابێ هەر دوولای لێکچواندن لە هەموو بارێکەوە

وەکو یەك بن چونکە بەم جۆرە هەردوولا ئەبن بە یەك شتو دوو وشەی هاوتا دەری ئەبڕن ، ئەوەشمان ووت کە نابێ هەر دوولا سەراپا لەیەك جیابن‌و فریان بە سەر یەکەوە نەبێت چونکە ئەو حەلە هیچ شتێ نامێنێ پێکیان وە بنووسێنێ کەواتە مەرجێکی پتەوە کە پەیوەندییەك هەبێ هەر دوولای تیا هاوبەش بن‌و لێکچواندنەکەی لەسەر هەڵ بەستریێ ..

ئەو کاتەی لێکچواندنی شتێ ئەکرێ بە شتێکیتر مەرج نییە ووردە درشتی لێکچوونەکە دەربخرێ چونکە ئێمە مەبەستمان دەرخستنی تەنها لایەتێکەو هیچیتر . وە پێویست ناکا لە هەموو کاتێکا هەموو بەشی پارچەکانی لێکچوون بە ووردی دەر بخەین چونکە ئەمەیان سەرنج لێدانی زانایەکە نەك هی بۆژێك یا نووسەرێك . بۆیە چاکتر وایە ئەو لایەنەی نووسەر خۆی مەبەستیەتی بیگرێ‌و بە تەواوی دەری ببڕێ ئیتر روو نەکا بەلای شتی ترەوە ..

لە کاتی داڕژتنی لێکچواندنا پێویستە ئاوڕێکی زۆر باش لە لێکچوون بدرێتەوەو بەچاوێکی تیژ سەیری بکرێ . بە چ جۆرێکەوە لێکچوونەکە تەووژمی بەگوڕ ئەبێت ؟! تا چە رادەیەك چەشە ئەبزوێنێ ؟! ئایا بۆی هەیە پیاو بخاتە گڕوگاڵ وەکو وورشەی چاوی کاڵ ؟! ئایا تا چ پلەیەك بەرز بەتەوەو وەکو کام ئەستێرە ئەدرەوشێتەوە ؟!

بێ گومان دۆزینەوەو هێنانی لێکچوونێکی پوختەو جوان‌و رۆشن چەشەیەکی ناسك‌و سەرنجێکی ووردو خەیاڵێکی تیژڕەوی ئەوێت ، خەیاڵێکی وا لە شاپەڕی شاهێن بە گوڕتر بێت تا بتوانێ وەك سیمرخ دونیا سەراو بن بکات‌و لەو پەڕی تاریکستانەوە دوڕو گەوهەری لێکچوونێکی رێك‌و لێوەشاوە بێنێت ! ..

لە راستیدا ئاگاداری کردنی لێکچوون‌و بایەخ پێدانی تەرازوویەکی راستگۆی لێکچواندنە ، بۆیە رەنگە سنووری راستی نەبەزێنین ئەگەر بڵێین : «لێکچوون تەرازوویەکە هەر نرخی لێکچواندن پیشان ئەدا بگرە توانا و لێهاتن‌و چالاکی نووسەریش پیشان ئەدا .. »

ئەوزار هەبوونی مەرج نی یە ، بگرە لە هەندێ شوێنا نەبوونی باشتریشە ، ئەوزار تەنها یەك ووشە نی یە بەڵکو خەرمانە ووشەیەکی رەنگاو رەنگە ، ئەمەش هەندێ دانە لەو خەرمانە :ـ

١ ـ وەکو : : دڵـدار ئەڵێ :ـ

تێکۆشـــە دایـم هـەر وەکـــو هەنگ بـــە
لــە مەیـــــدانی ژیـن ئامـادەی جەنـگ بـە

٢ ـ وەك : ناری ئەڵێ :

خەتی دەرسی عەشـــقی ناری وەك رقوومی خاڵەکەت
وا بە لەوحەی گەردنی بێ گـەردی وەك میناتـەوە

٣ ـ وێنـە : دیلان ئەڵێ :

ووردن هـــەر وەکـو نەسـتۆی نالەبـــار
خاشـن بـە وێنـــەی زنجیـــری زۆردار
وونن بـــە وێنـەی تـــۆزێ بـــا بـــردوو
تەفـــرن بـــە وێنـــەی تـــۆزی بابـــردوو

٤ ـ چەشنی : گۆران ئەڵێ :

وەختێ کـە ئەکەی چەشنی نەسیم لەنجە بەرەو مـاڵ
ئەگریجەیی تەڕ پەخشـە لەسەر کولـمو خەتو خاڵ

٥ ـ ئاسا : علی کمال باپیر ئەڵێ :

گیانەکەم بەخوا لـە دووری تۆ هەمیشە شین ئەکەم
بولبـول ئاسا بۆ گوڵـی رووت گریـەو ناڵین ئـەکەم

کاتێ کە لە ئەوزاری (ئاسا) وورد ئەبینەوە ، ئەبینین-زیاتر لە هەمو ئەوزارەکانی تر مەرجێکی تیایە ئەویش ئەوەیە کە هەر ئەبێ پاش (لەوچوو) بێت .. جا (لێچوو) لە پێشەوە بێت یا لە دواوە گرنگ نی یە ..

ـ ئەلێی پڕنەبێوە لێی :

سبەینێ بوو لە خەو هەستام کە روانیم بەفرە باریــوە
سلێمانی لەلێی بەلقیسە تارای زیـــوی پۆشـیوە

٧ ـ لەو ... ئەچێ : حمدی ئەلێ :

ئەحوالــی ئـەم زەمانــە لــە کایـەی منـاڵ ئەچـێ
دونیـــایــەکی چـــی پووچــە لــە زەرفی بە تاڵ ئەچێ

٨ ـ لەو ... ئەکا : علی کمال باپیر ئەلێ :

هێندە گریـاوم لە دووریت خۆشەویستی مصر حسن
دەشتو سارای شارەزوور ئێستا لە دەریای نیل ئەکا

(لەو .. ئەچێ ، لەو .. ئەکا) ئەم دوو ئەوزارەش مەرجێکیان تیایە کـە هەر ئەبێ (لەوچوو بکەوێتە نێوان (لەو ـ ئەچێ) یا (لەو ـ ئەکا).

٩ ـ تـەرز : .... ئەلێ :

قامـــەت تـەرز تـــوول سەول ســاوا کـــــرد
ئـەو ســـــاوا مـــــاوای جنـــت ئاوا کـــــرد

١٠ـ چون : مەولەوی ئەلێ :

گێج ســــەر کاوان جـــە ســـەردی بیـن کـەیل
بۆ مـــــەدان چنێ بـۆی بـــێ وەفایـی لەیـل (١)

(١) گێج = پێچ نــرم ، کاوان ـ بەرزاییەکان ، کەیل = پڕ ، واتە : پێچو لۆفەی شاخەکان پڕ بووین لە سەرماو سۆڵو بۆنی ساردییان لێــوە دێت ، بۆنی ئەو ساردو سڕیەش وەکو بۆنی بێ وەفایی لەیل وایە کە مەبەستی بە لەیل یارە ... بۆ ئەم روونکردنەوەیە سەیری (دیوانـی مەولەوی ـ لێکدانەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ) کراوە

# دابەشکردنی لێکچواندن

## بە گوێرەی هەر چوار بنەڕەتەکانی

(لێچوو) و (لەوچوو) دوو ستوونی پتەون و لێکچواندنیان راگرتووە، ئەگەر یەکێکیان کەم بێت یا ئەوەتە لێکچواندنەکە ئەبێتە تەم و ئەڕەوێتەوە، یا ئەوەتە بە گورزتر ئەبێ ئەو حەلەش ئەبێتە (خواستن) .. هەر چۆن بێت ناتوانین دەست بەرداری هیچێکیان بین .. ئەمێنێتەوە ئەوزار و لێکچوون، ئەم دووەش هەندێ جار تاکەتاك دیار ئەبن و هەندێ جاری‌تر وون ئەبن ، هەروەکو ئەوەشیان ئەبێ کە هەردووکیان پێکەوە (ئەوزار و لێکچوون) ناویان بێت وەکو ئەشگونجێ کە هەر دووکیان پێکەوە فڕێ بدرێن ..

لێکچواندن بە گوێرەی هەر چوار بنەڕەتەوە بەم جۆرەی خوارەوە دابەش ئەکرێ :ــ

١ ــ بە گوێرەی ئەوزار :

ئەبێ بە دوو بە شەوە :

أ ــ لێکچواندنی بەرەڵلا :

ئەو جۆرەیە کە ئەوزاری تیا بێت ، ئەمەشیان وا نەبێ ئەوەندە بە تین و تاو بێت . وەکو

چــــاو هێلانـــــەی نارامــــــی دڵ
پەنجـەی ناسـك دەسـتــــی وەك گــوڵ

دەستی نەرمی بە گوڵ چواندووە ، ووشـەی ( وەك ) ئـەوزارە ، لێکچوون نەهاتووە . بەم جۆرە لێکچواندنی بەرەڵلا ئەوەیە کە لە لێچوو و لەوچوو ئەوزار دروست بووبێ . لێکچوونی تیا نەبێ .

ب ــ لێکچواندنی چەختاو :

ئەو جۆرەیە کە ئەوزاری تیا نەبێ بەلام لێکچوونی تیابێ . کـە واتە ئەم لێکچواندنە لە لێچوو و لەوچوو و لێکچوون پێك دێت و ئەوزاری

تیا نابێ ، وەکو احمدی خانی ئەڵێ :

مشرق تۆی ئاگری تە ظاهـــــر    مغرب لــەزو باطنــی مــن ئاگـــر

دائم دەسوژیت دەرشتەی جان    تە ناسوژیتن بە غەیـری ئەزمـــان

لەنیوەی یەکەم مەبەستی لە تۆ مووم ، ئەم موومە بە رۆژهەلات ئەچوێنێ ، مووم لێچووە ، رۆژەلات لەوچووە ، ئاگـــری هـــەردوولا لێکچوونە . ئەوزار نەهاتووە . دیسان لە نیوەی دووەم خۆی بە خۆرنشین ئەچوێنێ ، خۆی لێچووە ، خۆرنشین لەوچووە . ئەوزار نەهاتووە . بەم جۆرە هەر لێکچواندنێك تەنها ئەوزاری کەم بێت و سێ بنەڕەتەکەی تری تیا بێت ئەوە لێکچواندنی جەختاوە .

٢ ـ بە گوێرەی لێکچـــوون :

ئەگەر لە ســوچی لێکچوونەوە تەماشای لێکچواندن بکەین ئەبێ بە دوو بەشـــەوە :

ا ـ لێکچوانـــدنی دریـــژە :

ئەوەیە کە شان بە شانی لێچووو لەوچوو لێکچوونی تیا باسکرابێ، بەڵام ئەوزار نەبێ وەکو عوسمان عوزێری ئەڵێ :

لێـــوی شیرینـــی ئـــاڵی هەنگوینیـــت

چـــاوی خومـــاری پـــڕ لـــە ئەفـــسوونیت

هۆنەر لێوی ئاڵ و شیرینی یاری ئەکا بە هەنگوین . لێو لێچووە ، هەنگوین لەوچووە ، شیرینی و نەشئە بەخشی هەر دوولا لێکچوونە . ئەوزار نییە .

ب ـ لێکچوانـــدنی کورتە :

ئەو لێکچواندنەیە لێکچوونی تیا نەبێت تەنها لە (لێچوو ، لەوچوو ، ئەوزار) پێك هاتبێ . بابا تاهیری هەمەدانی ئەڵێ ـــ

ئەبۆنی زولفی تۆ مەفتونم ئەی گوڵ    ز رەنگی رووی تۆ دڵخوونم ئەی گوڵ

منی عاشق ز عەشقت بێ قـــەرارم    تو چون لەیلاو من مەجنونم ئەی گوڵ

ئەلێن . ئەی گوڵ وایە ئەی یار لە بۆنی زولفی تۆوە کە وەک میشکی خەتاو عەتری چین وایە مەست و بێ هۆشم • لە ڕەنگی ڕووی تۆوە وەکو خوێنە دڵم لەت لەت و زامدارە منی ئەشق و ئەڤینداری تۆ ؛ سووتاو بە گڕی خۆشەویستی تۆ ، ئەشقی تۆ بە جۆرێ لە سەرێ داوم وێڕ و کاسی کردووم ! وێڵ و سەرگەردان و بێ جێگاو شوێن ماوم ! خۆشەویستی وا لە هەناومەوە تواوەتەوە کە حەجمانم بڕاوە وەکو مەجنوونی شەیدا داوامەی کێو و هەرەت و هەڵدێر ، بە دوای تۆوە ئەگەڕێم تۆ ! کە (وەکو لەیلەکەی بێ مەیلەکە ) وایت •• یاری بە لەیلا چواندووە ، یار لێ چووە ، لەیلا لەوچووە ، (چون) ئەوزارە • لێکچوون نەووتراوە ••

٣ ــ بە گوێرەی ئەوزار و لێکچوون پێکەوە :

ئەگەر بە چاوێکی ئەختێ فراوانتر بڕوانینە لێکچواندن کە ئەوزار و لێکچوون پێکەوە بگرێتەوە ، لەم بارەیەوە لێکچواندن دوو بەشە :

ا ــ لێکچواندنی درێژەی بەرەڵلا :

ئەو لێکچواندنەیە کە هەر چوار ڕەگەزەکانی بە ئاشکرا تیا هاتبێ، لطیف بەرزنجی ئەڵێ :

ئـەو لێـــوە ســـوورە کە وەکـــو خوێنـــە
ناســـک ، ڕێـــکو جـــوان ، تـــاکو بێ وێنـــە

لێوی دلخوازی بە خوێن چواندووە لە سووریدا •• هەر چوار بنەڕەت ئاشکرا هاتوون ، لێو لێ چووە ، خوێن لەوچووە ، وەکو ئەوزارە، سووری هـەر دوولا لێکچـوونە • ئەگـەر بە وردی سـەیری ئـەم جـۆرە لێکچوانـدنە بکـەیـن دەبینیـن لـە پێشـا ئـەوزاری تیایــە ، کـــە ئـــەوزاریش هەبـــوو ئەبێ بـ ( لێکچواندنی بەرەڵلا ) وەکو باسمان کرد ، لەگەڵ ئەمەشا ( لێکچوون ) بە ئاشکرا هاتووە ، کە (لێکچوونیش) هاتبێ ئـەبێ بە (لێکچـواندنی

درێژە) وەکو لێی دواین . کەواتە (لێکچواندنی درێژەی بەرەلـــزن) لـــە کۆکردنەوەو موتوربە کردنی لێکچواندنی (بەرەڵلا) و (درێژە) دروست بـــووە .

ب ـ لێکچواندنی رەوان :

لەم لێکچواندنە تەنها لێچووو لەوچوو ئەووترێ‌و بەس ! واتـە لێکچوونو ئەوزار ناویان نابرێت ( حریق ) ئەڵێ :

خۆت وەکو سولتـانو چاوت حاکمو برۆت شمشیر
تیـری موژگانـت وەزیرە مەشـقی خونخواری ئەکـا

(حەریق) لەپێشا یاری کردووە بە سولتان ، بەڵام چونکـە ئـەوزاری لەگەڵا هێناوە سەیری ناکەین ، بەڵکو تەماشای ئەوە ئەکەین کە چـاوی کردووە بە حاکم . چاو لێچووە ، حاکم لەوچووە ، ئەوزارو لێکچـوون نەهاتوون. ئەگەر نەختێ لەم جۆرە لێکچواندنە وورد بینەوە ، ئەوزاری تیالیەبە،کە ئەوزاریش نەبوو ئەبێ (بەلێکچواندنی جەختاو) وەکو باسمان کرد . هەروەها لێکچوونیش نەهاتووە ، کە لێکچوونیش نەبێ ئەبێ بـە لێکچواندنی قوڵە . لەبەر رۆشنایی ئەم لێکدانەوە ئەشێ بـەم جـۆرە لێکچواندنە بووترێ «لێکچواندنی قوڵەی جەختـاو» یا وەکو ( بەگـر گـەردی) ئەڵـێ :

پەپوولەی گیانم لـە ژیـن دڕاوە بادەی پڕ هیوام لـە دەسـت رژاوە
رۆناکی مانگـی گەنجیـم نەمـاوە ئەستوونی راستی شـادیم چەمـاوە
گـەلام لــە داری رازا وەریـوە تاســەم لە لانـەی بیـرا تەریـــوە

لێرەدا شاعیر لە دۆزخێکی سەختی رەش‌بینی هەڵئەقرچێ بۆیە کـە دێتە دەنگ ئاوازی خەمو مەینەت بڵاو ئەکاتـەوەو بڵێسـەی نائومێـدی ئەپرژێنێ . گیانی کردووە بە پەپـەوولە . گیـان لێچـووە ، پەپـوولە لەوچووە . لێکچوونو ئەوزار نەهاتوون .. سـەیری جۆشـی هەڵچوونی دڵی شاعیر بکە بەوەندە گڕی دانەمرکاوە کە لێکچواندنی رەوان بێنێ ،

بەلکو شەپۆلی ئازارو نائومێدی رای نەمانێ بۆ نەودی زیابر پێ نە مەبەست هەلبرێ .. لەوچوو کە پەپوولەیە ئەکا بە موزافەو ئەیداتە پال لێچوو کە گیانە ، ئەلێ (پەپوولەی گیانم) .. هەروەها بە گوێرەی لێکچواندنەکانی تریش کە هەموویان لێکچواندنی رەوانن لەوچوویان تیا دراوەتە پال لێچوو .. «بادەی هیوا ، مانگی گەنجی ، ئەستوونی شادی ، داری راز ، لانەی بیر .. » .



## دابەشکردنی لێکچواندن

### بە گوێرەی هەردوو لا ... (1)

لێکچواندن وەکو درەختێکی زل وایە گەڵێ لق و چاێ لێ ئەبێتەوە، بە هەموو لایەکا پەل بلاو ئەکاتەوە . لە عەرەبەکان : مبرد ، عسکری ، ابن رشیق ، عبد القاهر الجرجانی ، حلبی ، سکاکی .. ئەمانەو گەلێکی تریش هەر یەکە لە سووچێکەوە بە پێی بیرو باوەڕی تایبەتی خۆی لێکچواندنی دابەش کردووە ، نووسینی ئەم هەموو جۆرە دابەش کردنانە کات و شوێنێکی زۆری ئەوێت .. بۆیە جارێ لە پێشا بە گوێرەی هەستی و ژیری هەردوو لا بەم چەشنەی خوارەوە دابەش ئەکەین :

١ ــ لێکچواندنی شتی هەستی بە شتی هەستی :

شتی هەستی ئەوەیە کە بەر فەرمانی هەستێك یا پتر بکەوێ : هەستەکانیش ئەمانەن : ١ــ دیتن ، البصر ٢ــ بیستن ــ السمع ، ٣ــ بۆن‌کردن ــ الشم ، ٤ــ تام کردن ــ الذوق ، لێك خشان ــ اللمس ئەبێ ئەوەشمان لەبەر چاو بێت کە زاناکانی پەروەردەو هۆڵان سەلماندوویانە کە تا ژمارەیەکی پتر لەو هەستانە بکەونە کار لە ناسین و فێربوونی شت ، ئەو شتە باشتر ئەچێتە دڵەوە .. نموونە (گۆران) ئەڵێ :

کوڕی خۆم ڕێبواری جوان و هەرزەکار
جیاوازی چیت دیوە
لە کانی و پلووسکی ژێر سێبەری دار
لە زیخی مرواری و ئاوی وەك زیوە

زیخی بە مرواری و ئاوی روونی بە زیو چواندووە ، لە یەکەم زیخ و مرواری هەر دووکیان شتی هەستین ، هەروەها لە دووەمیشا (ئاو و زیو) ، چونکە ئەدیترێن و دەستیشیان لێ ئەدرێ .

٢ ـ لێکچواندنی شتی ژیری بە شتی هەستی :

شتی ژیری ئەوەیە کە تەنها بە هۆش و بیرو لێکدانەوە بزانــرێ و نەکەوێتە بەر بەلی هیچ یەکێ لە هەستەکانەوە ، جا لێرەدا شتێکی ژیری بە شتێکی هەستی ئەچوێنرێ ، ئەمەشیان زۆر بە تین و هێــزە چونکــە لێچوو کە شتێکی ژیری‌یەو هەستی پێ ناکرێ لەگەڵ لەوچوو کە شتێکی هەستی‌یە بەرامبەر یەك ئەکرێن . وەکو (زیوەر) ئەڵێ :

تۆبەیێکــم کــردووە وەك کێــوی ئاســن مەحکــەمە

تــا لــە دونیادا ببینم عەشــقی چاو مەستانی خــۆم

( تۆبە ) شتێکی ژیری‌یە ، ئەم تۆبەیەی بە کێوی ئاسن چواندووە کە شتێکی هەستی‌یە لە بارەی دارِزان و خۆ راگرتنەوە .

٣ ـ لێکچواندنــی شتی ژیــری بە شتی ژیــری :

شتی ژیری ئەو زاهیرە نەسیانە ئەگرێتەوە کە ناکەونە چەنبــەری دەســەڵاتی هەستەکانەوە وەکو : «زیرەکی ، چالاکی زانیــن ، هێمنــی ، ئازایەتی ، توورەیی ، ... » وەکو بڵــێی : « هێمنــی پیــاوەتی‌یە » . هەردووکیان شتی ژیرین ، یا وەکو (درۆ بێ ئابرووی‌یە) ئەوانەش هەردوو کیــان شتی ژیریــن .

٤ ـ لێکچواندنی شتی هەستی بە شتی ژیــری :

ئەوەیە کە شتێکی هەست پێکراو بە شتێکی وا بچوێنرێ کە زەینی بێت و نەکەوێتە بەر هیچ هەستێکەوە ، کاکەی فەلاح ئەڵێ :

نــەوە کاســەکەم ئالــــە وەك مــــردن

پــڕە لــە ژەهــــری خەفــــەت و ماتــــەم

کە ئەڵێ کاسەکەم مەبەستی ئەو شتەیە کە لە کاسەکەدایە . ئەمەشیان خوازەیەکی ـ مجاز ـ زۆر جوان و نایابە کــە پەیوەنــدی نێوانیان

بوونی‌یە :ا کۆنەی فەلاح ئەم تایبەیە بە مردن ئەچوێنێ لە مەیدانی ژینی:
(کاسە) شتێکی هەستی‌یە ، تام ئەکرێ . بەلام مردن شتێکی زیری‌یە .

# دابەشکردنی لێکچواندن

## بە گوێرەی هەردوو لا ... [2]

بە گوێرەی لێکچواندنی چەند شتێك بە یەك شت یا یەك شت بە چەند شتێك ، لێکچواندن ئەکرێ بە دوو بەشەوە :

١ ــ لێکچواندنی تەخت : ئەوەیە کە دووشت یا پتر بە یەك شت بچوێنرێ، واتە لێچوو چەند شتێك بێت و لەوچوو تاکە شتێك بێ .. وەکو گۆران ئەلێ ،

نەسیمی بۆن خۆش ، کزەبای فێنك ، وەك نەوای ئیلهام
سەمای جوانی پەری تەبیعەت دێنێتە ئەنجام

گۆران دوو شتی (نەسیمی بۆن خۆش ، کزەبای فێنك) بە یەك شت ( نەوای ئیلهام ) چواندووە .

٢ ــ لێکچواندنی کۆ : ئەوەیە یەك شت بە دووشت یا کۆمەلە شتێك بچوێنی ، واتە لێچوو یەك بێت و لەوچوو کۆمەلە شتێك بێت . حاجی قادری کۆیی ئەلێ :

بێخەویم دایێ ، نەخۆشیم لێ‌گری چاوی کەچی
وەك منو بەختی سیاهم هەر نەخۆش‌و نووستورە

پاش ئەوەی حاجی بە لرخی بێخەوی نەخۆشی لە خۆشەو لیستەکەی ئەکرێ ، دێ چاوی رەشی بە خۆی‌و بە بەختی رەشی خۆی ئەچوێنێ .. دبارە حاجی لێکچواندنی یەك شتی کردووە کە ( چاوی یارە ) بە دوو شت کە خۆی‌و بەختی رەشیەتی .

## بە گوێزی هەردوو لا ... [1]

وا ئەبێ هۆنەر لە یەك دێڕە هۆنراوەدا زیاتر لە یەك لێكچواندن دێنێ ، واتە دوو شت یا پتر بە یەك ئەچوێنێ . جا ئێستا لە بارەی چۆنیەتی هێنان و دارشتنی ئەم لێكچواندنانە لە دێڕێكا ، لێكچواندن ئەكرێ بە دوو بەشەوە :

١ ـ لێكچواندنی بڵاو :

ئەوەیە كۆمەڵە لێكچواندنێك لەیەك دێڕە هۆنراوەدا بێنێ ، بە مەرجێ هەریەكەیان سەر بەخۆبێت و بە وانی ترەوە نەبەسترابێ . بە كورتی لەپێشا لێكچواندنێك بە تەواوی بێنێ ئنجا كە كۆتایی بەو هێنا بچێتە سەر لێكچواندنێكی تر ، ئەویش بە تەواوی بێنێ ئنجا بچێتە سەر یەكێكی تر ، نەك هەموویان تێك هەڵبكێشێ . (كوردی) ئەڵێ :

كەبابـ دڵ ، خوێـن مەیە ، ساقی فیراقت
قەدەح چاوو مەزەم ئەسرینە بۆ تۆ

لێكچواندنی ( دڵی ) كردووە بە ( كەباب ) ، ( خوێنی ) كردووە بە (مەی) ، (چاوی) كردووە بە (قەدح ، پیاڵە ) ، (ئەسرینی) كردووە بە (مەزە) . هەر لێكچواندنێكیشی لەمانە سەربەخۆیە .

٢ ـ لێكچواندنی پێچراو :

ئەوەیە كە ئەو لێكچواندنەی هۆنەر لەیەك هۆنراوەدا ئەیانهێنێ هەموو لێچووەكان لە تەنیشت یەكەوە ریز بكا پاشان هەریەكەیان بە

[illegible]
بەپێچەوانە ، لەپێشا لەوچووەکان بێنێ ئنجا لێچووەکان • ( سالم )
ئەڵێ :

لە موژگانو بڕۆ کێشاویە چاوت
بەرابەر بۆ دلم شمشێرو خەنجەر

(سالم) موژگانو برۆی پێکەوە هێناوە ، ئەمە لە نیوەی یەکەم ، لە نیوەی دووەم شمشێرو خەنجەری هێناوە موژگان بە خەنجەرو برۆی بە شمشێر چواندووە ، وە نەبێ هەر یەکە لەم لێکچواندنانە بە جیا جیا هاتبێ بەڵکو تیزو فیز تێك هەڵکشاون •• لەپێشا هەردوو لێچوو (موژگانو برۆ) هاتوون ، پاشان هەردوو لەوچوو ( شمشێرو خەنجەر ) هاتوون • شمشێر بۆ برۆو خەنجەر بۆ موژگان ئەگەڕێتەوە • وەکو ئەوە ئەبێ ئەوەش ئەبێ کە هۆنەر لە پێشا لەوچووەکان بێنێ ، ئنجا لێچووەکان • ( نالی ) ئەڵێ :

گەر نابو تابی جەننەتو دۆزەخیت دەوێ
بڕوانە ناوچەوانی بەشووشو برۆی عەبوس •

لەپێشا لەوچووەکانی هێناوە ( جەنەتو دۆزەخ ) ئنجا لێچووەکان ( ناوچەوانی بەشووشو برۆی عەبوس ) •

لێکچواندنی پێچراو دوو بەشە :

أ ـ ئەوەیە چەند لێچووەك بە دوای یەکەوە بێنی ، ئنجا لەوچووەکان بەریز بێنی • واتە بەشوێن یەکەوە هاتنی لێچوو و لەوچوو لە هەر دوولادا وەکو یەك بێت ، یاخود ئاشکراتر بڵێین ئەبێ یەکەم شت بۆ یەکەمو دووەم بۆ دووەمو سێیەم بۆ سێیەم ••• بچێتەوە •• مەولەوی ئەڵێ :

وە بۆی ئەو باڵاو خەتو کوڵمو دەم
سەرو سەوزو گوڵ خونچە بەو دەم

لەپێشــا لێچووەکانی هێناوە : (بالا ، خەت ، کولم ، دەم ) جا کــە لە نیوەی دووەم لەوچووەکان دێنێ بە پێی ئەم ڕیزەوە ڕیزیان ئەکــات • یەکەم جار (سەروو) دێنێ کە بۆ یەکەم شت (بالا) ئەچێتەوە • بەم جۆرە دووەم بۆ دووەم وسێیەم بۆ سێیەم دەگەڕێتەوە • ئەمەشــیان پــێی ئەووترێ پێچانو کردنەوەی ڕێك [1]

ب ــ ئەوەش وا ئەبێ کە ڕیزی بە شوێن یەکەوە هاتنی لێچــوو و لەوچووەکان لە هەردوو لادا وەکو یەك نەبێ •• بە کورتی لێرە گــوێ نادرێ بە ڕیزی لێچوو لەوچوو بەڵکو هەر چۆن بێــت وا دائەنــرێ • طاهــر بــەگی جــاف ئــەڵێ :

بــــــرۆو ڕوخســارو زولــف لێــوی ئالــــت

شــەوو ڕۆژو هیـــلالو عەقــــدو مەرجــــان

لەپێشا کۆمەڵێك لێچووی ناو بردووە (برۆ ، ڕوخــار ، زولف ، لێو) بەڵام لە کاتی هێنانی لەوچووەکانا (شەو ، ڕۆژ ، هیلاك ، عەقدو مەرجان) گوێی نەداوە ، بە وەك یەکی ڕیزیان • ئەمەشیان پێی ئەووتــرێ ( پێچانو کردنەوەی نارێــك ) [2] ••

## لێکچواندنی دوو ســەرە

ئەوەیە کە نووسەر یا هۆنەر شتێك بە شتێکیتر بچــوێنێ ، پاشــان بگەڕێتەوەو لێکچواندنەکە وەربگێڕێ ، واتە لێچوو بکا بە لەوچوو بــە پێچەوانەش • بە کورتی ئەم جۆرە لێکچواندنە بریتییە لە لێکچواندنــی دوو شت بە یەکتری • (حمدی ئــەڵێ :

هــەر نالــە وا لــە بورجــی جەلالا وەکو هیـــلال

هــەر ماهە وا لــە کونجــی مەلالا لــە نــال ئەچــی

---

(1)(2). لە بەرگی دووەمی ڕەوانبێژی کە (جوانکاری)یە بە دوورو درێــژی باسی پێچــانو کردنەوە کراوە •

ئەڵێ : زەمانە بە پێچەوانە هەڵچەرخاوە ، ئەو ناڵە بۆ زخمی کێشە
جێگەی زێر سمی وولاخانە بووە بە مانگی یەك شەوە ـ هیلال ـ
( چونکە مانگی یەك شەوە خۆشەویستە ، ئەڵێ ئەم ناڵە بە تاڵە وەك ئەو
مانگە جوانە وایە ، نەك هەر ئەوەندە بگرە چەرخی چەواشە بە تەواوی
پشتی لە پیاوی پیاو هەڵکردووەو فرێی داوەتە چاڵی کەساسیو نەگبەتی
کە وەکو مانگ ئەدرەوشاهەوە .. ئێستا هیلال وەکو ناڵ وایە ..

تەماشای ئەم بیرە ووردەو خەیاڵە تیژە بکە ، یەکەم جـ (ناڵ) ئەکـا
بە (هیلال)و ئەی باتە کەلووی جەلال ئنجا مانگ ئەکا بە (ناڵ)و دای
ئەشکێنێ بۆ کونجی مەلال . ناڵ ئەکا بە هیلال‌و هیلال ئەکا بە ناڵ ..
هەروەها ( قانع ) ئەڵێ :ـ

ئەمن بولبولی بێ دانە منو ئێوە هەژاربن
هەردوو وەکو یەك موتەمزیری فەسڵی بەهاربن
تۆ چەشنی منو من وەکو تۆ بێ کەس‌و کاربن
داماوو کزو دەربەدەری کوچەیی شاربن
پابەندی قەفەس خانە وە یا دیلی دیاربن

لەم هۆنراوەدا لێکچواندنی دوو سەرە هەیە ، کە لە بێ کەس‌و کاریو
بێ دانەو دەربەدەریو بەندایەتیدا خۆی بە بولبول‌و بولبولی بە خۆی
ئەچوێنێ !!!

## لێکچواندنی ئاوەژوو

لێکچواندنی ئاوەژوو ئەوەیە کە لێکچواندنەکە وەربگێڕین ، واتە
لێچوو بکەین بە لەوچوو بەو نیازەی کە لێکچوونەکە لەو جوانترو
بەهێزترە تا لە لەوچوو ، ئەمەشیان زادەی هوشەکارییە کە لە دوولاوە
دەرئەکەوێ :

١ ـ لێکچواندنی ئاوەژوو وا پیشان ئەدا کە لێچوو بە تینو تەوژم

زە بە ئەوچوو دەربارەی لێنچووەکە لە ئەرچی لە راستیشدا وانی یە .

٢ ـ بایەخدان بە لەوچوو چ لەبارەی واتاوە چ لە بارەی روخسارەوە، وەکو چاو برسیەك روخسارێکی جوان بە نان بچوێنێ .. کە برسیەکە ئەم جۆرە لێکچواندنە ئەکا هەر لەبەر ئەوەیە کە زۆر بە مەراقو پەرۆشە بۆ نانو رەنگە خەونیشی پێوە بینێ،کە ئەوەش ئەکا هەر بۆ ئەوەیەتی کە بایەخ دانی خۆی بە نان دەر بخا .. ئەمەش پێی ئەووترێ (دەرخستنی مراز ـ اظهار المطلوب) کە کابرا لە پەنای شتێکی ترەوە ویستو مەرامی خۆی پیشان ئەدا ...

وەك ووتمان ئەم چەشنە لێکچواندنە پڕاو پڕی هووشەکاریە ؛ زۆرتر ئەو کەسانە هانای ئەبەنە بەر کە لێکچواندنی سادەو ئاسایی کرمی سەریان ناکوژێ . وەکو (هەردی) ئەڵێ :

ئەگەرچی وەك خەیالی من
عەبا دووری لەشی داوە

هەردی بەوەندە جۆشی دلی دانامرکێتەوە کە خەیالی خۆی بە عەبا بچوێنێ ، بەلکو دوورەدانی خەیالی خۆی لە قەدو بالای یار لووسو بێ کەلێنتر ئەبینێ ـ یا ئەیەوێ وای پیشان بدا ـ لە داپۆشینو پیا هاتنەوەی عەبا ، بۆیە عەبا بە خەیالی خۆی ئەچوێنێ . بە پێی ئەم لێکچواندنە خەیاڵ ئەبێ بە لێچوو ، کە لە راستیدا خەیالەکە وەکو عەبا دووری لەشی داوە ، واتە لە بنەڕەتا (خەیاڵ)لێچووە (عەبا) لەوچوو ، بەلام کە هەردی هەڵی گێڕاوەتەوەو ئاوەژووی کردووە، هەر بۆ دەرخستنو پیشان دانی هونەکاریە .

چەند سەرنجێ :

١ ـ هەر لەم جۆرە لێکچواندنەیە کە هونەر بە شێوەیەکی نەشارەزایانە دێتە پێشو بە پرسیار کردنی خۆی لە راستەقینەی شتە نەبەستەکە خەشیم ئەکات کە لە راستیدا خۆی زۆر چاك ئەزانێ چیە !! پرسیارەکەش

که ئەکا هەر بۆ ئەوەیەتی ئەو خۆ حەشیم کردنەکەی بە شێوەیێکی [illegible]
تەلەم ، وەك هەلخەلەتاندنێکی هونەری لە ژێرەوە بێ .. وەکو کامەران
ئەڵێ :

بەژنی تۆ یا بەژنی ڤینۆس ئەی فریشتەم شەنگترە
خونچە تەنگتر یا دەمی تۆ یا دلی من تەنگترە

هۆنەر ویستوویەتی بەژنی یار بکا بە بەژنی ڤینۆس ، خۆ لە منو
تۆش باشتر ئەزانێ کە بەژنی یاری ئەو هەر تۆزی بەژنی ڤینۆس ناشکێنێ
بەلام بۆ ئەوەی لێکچواندنەکە بەگوڕتر بێت هاتووە هێدم گرتوو خۆی
حەشیم ئەکا ، گوایە کوڕ سەری لێشێواوە نازانێ کامەیان جوانترە ئەم
ئەزانێ‌و خۆ حەشیم کردنەش بە پرسیار دەر ئەخا [1] ..

لە نیوەی دووەمیش سفرەی هەمان مەسەلەی یان کردۆتەوە بەلام نەك
لەسەر زەمینەی لێکچواندن بەلکو لەسەر زەمینەی بەراورد کردن .

٢ ــ چاکتر وایە لەم جۆرە لێکچواندنە لەوچوو ــ پێش
ئاوەژووکردن ــ شتێکی هەستی بێت چونکە بەمەوە باشتر ئەچەسپێ ..
( بەکر گەردی ) ئەڵێ :

کێوی سەفێن لەسەر زەمین چەسپاوە وەك پەیمانی من
کەچی یارم تۆراوە لێم لەبەر دیدەی دۆستو دوژمن

لێکچواندنی پەیمانی نەگۆڕاوی کردووە بە کێوی سەفێن ا چۆن
کێوی پۆلاینی سەفێن دارژاوەو رەگی چۆتە ناخی زەمین دیارە پەیمانی
بریتیش بەم جۆرە لە دلو دەروونیا دارژاوەو تێکەلاوی خوێنی دەمارەکانی
بووە . بۆیە کە ئەیبنی پەیمانەکەی بەم چەشنە تێکەل خوێنی دلیەتی بە
لاپەوە ستەمە بلێ : «پەیمانی من وەك کێوی سەفێن » واتە پەیمانی بە
سەفێن بچوێنێ ، بەلکو لێکچواندنەکەی ئاوەژوو کردووە ، واتە لێچوو کە

---

(١) ئەم جۆرە هونەرە لقێکی جوانکاریە پێی ئەووترێ راگومکی
ئاشنا ــ تجاهل العارف) لەبەرگی دووەم باس کراوە .

پەیمانی خۆبەتی بە چەسپاوتری داناوە لە کێوی سەفین .. سەفینی بەسە پەیمانی خۆی چواندووە .

## لێکچواندنی پەسندیدە

وا ئەبێ ئەو کاتەی کە ئەتەوێ شتێك بە شتێکی تر بچوێنی لێچوو پەسندتر بکەی لە لەوچوو .. ( سەلام ) ئەڵێ :

چەند کەسێکی لاوو چەند گەنجی شەریفو دڵ قەوی
اسمی اعظمیان ئەزانی راپەڕین زوو دەستو بەرد
یەك دەمی بەگیان گرتو هەموو رووەو ئەفسوونی دێو
تێپەڕین وەك شێری بێشە ، شێر لە هەڵمەتیان ئەمرد

سەلام گەنجو لاوانی (ناوی أعظم زان )ئەکا بە شێری بێشە ، (لاو) لێچووە ، ( شێر ) لەوچووە . پاشان دڵی دانەمرکاوە بای داوەتەوە ئەڵێ : « شێر لە هەڵمەتیان ئەمرد » جگە لەوەی کە ئەم هونەرە پیشەیەکی سەربەخۆیەو پێی ئەووترێ ( الرجوع ــ بادانەوە ) بەڵام ئێمە هەر تەماشای ئەوەندە ئەکەین کە ئەڵێ نەك وەکو شێر وابوون بەڵکو لە شێر ئازاتر بوون چونکە کە شێر چاوی بە هێرشی ئەوان ئەکەوت لە ترسانا ئەمردو ئەتوایەوە .. سەلام ئەم لاوانەی پەسندترو چاوقایمتر داناوە لە شێر . هەر لەبەر ئەم پەسندکردنەشە پێی ئەووترێ « لێکچواندنی پەسندیدە » .

با وەکو : « راستە نێرگس لەبەر چاوی کاڵتا ، بنەوشە لەبەر ئەگریجەی خاوتا ، خونچە لەبەر لێوی لەعلینتا ، بلوور لەبەر گەردنی بێ گەردتا ، سنەوبەر لەبەر کەمەرتا ، چنار لەبەر باڵاتا : سەر شۆڕو شەرمەزارن .. »

لووسەر ئەبەوێ : چاوی کاڵ بە نێرگس ، کوڵمی ئاڵ بە سێو ،

ئەگریجەی خاو بە بنەوشە ، لێوی لەعلێن بە خونچە ، گەردنی بێ گەرد بە بلوور . ئەمەو بە سنەوبەرو بالای یار بە چنار بچوێنێ ... بەڵام بەم جۆرە لێکچواندنانە رازی نابێت بەڵکو هەموو ئەم شتانە بەرامبەر یارەکەی بە شەرمەزارو سەر شۆڕ ئەزانێ .. ( قانع ) ئەڵێ :ـ

گوتم بولبول بە دیتی خۆت گولت پێ چاکە یا کولمی
بە دەنگی ئاشکرا بولبول دوو سەد طعنەی لە شەشپەردا .

تەماشای ئەو بیرە بەرزەی ( قانع ) بکە .. قانع نایەوێ راستەو راست کولمی یاری بە گوڵ بچوێنی ، چونکە ئەم گوڵە بە لای ئەوەوە هەر هیچ نییە بە چاو کولمی یارەوە ، ناشیەوێ خۆی فەرمانێك بدا کە کولمی یارەکەی لە پەڕەی گوڵ ناسکترە ، چونکە ئەگەر وا بکات ئەترسێ قسەکەی لێ وەرنەگرن‌و بەر پەرچی بدەنەوە و بڵێن : چونکە تۆ دڵدارو سەوداسەری یارەکەتی بۆیە کولمی ئەوت بەلاوە جوانترە لە گوڵ . لە ترسی ئەم قسەیە ( قانع ) خۆی لە فەرمان دانان دەر ئەبات‌و بانگی بولبول ئەکات‌و ئەم پرسەی پێ ئەکا بۆ ئەوەی بولبول بێ بە راوێژکار . کە بولبول دێت‌و سەیرێکی گوڵ ئەکات ـ کە یاری نازداری خۆیەتی‌و شەوو ڕۆژ وەکو پەروانەو چرا بە دەوریا ئەسووڕێتەوە ـ پاشان چاو هەڵەبڕێت ئەڕوانێتە کولمی یاری ( قانع )و بەراوردیان ئەکات ! لە شوێن خۆیا مات‌و شەرمەزار ئەبێ . چونکە کولمی یاری قانع لە گوڵ جوانترە ، لە حەیفانا ئەوەتە شەق نابات‌و لە جیاتی ئەوەی تەرازووی جوانی بۆ گوڵ دابگرێ ـ کە یاری خۆیەتی ـ ناچارە کولمی یاری قانع پەسندتر بکات .. نەك هەر ئەوەندە زیاتریش ! لە داخانا گوڵی ئەوەندە پەست‌و زیز دێتە بەرچاو ئەی داتەبەر تیرو لەشتەر ـ چونکە لە مەیدانی جوانیدا بۆڕی خواردووە ـ ئەزانی گولیش کامەی هەڵبژاردووە ؟ بێ گومان گولی بۆن‌خۆش‌و رازاوەی شەست‌پەڕ ...

لەم هۆنراوەیەدا ( قانع ) یەکەم جار ئەیەوێ کولمی یار بە گوڵ

بچوێنێ بەڵام پەشیمان ئەبێتەوە ، ئونمی پێ ئە گوڵ جوانتـــــرە ، بۆ دڵنیایش پرس بە بولبول ئەکات ، بولبولیش هەر کوڵم پەسندتر ئــەکات ، ئەم پرس‌کردنەشی بە بولبول جوانی‌یەکی یەکجار زۆر بە لێکچواندنەکــــە ئـــەدا ..

ئەگەر لێکچـــواندنی پەسندیدە لـــەگەڵ لێکچواندنی ئاوەژوو بەراوردبکەین ، ئەبینین ئەم دووە زۆر لەیەك ئەچن ، هەر دووکیان لێچوو پەسندتر ئەکـــەن لە لەوچـــوو ، ئەوەندە هەیە لە لێکچاندنی ئاوەژوو پەسندتر ئەکـەن لە لەوچـــوو ، ئەوەندەهەیە لە لێکچوانــدنی ئاوەژو: لێکچواندنەوە دەرناچێ ... بەڵام لە لێکچواندنی پەسندیدە هـــــــەر ئەوەندەیە لێچوو پەسندتر ئەکرێ لە لەوچوو بەس !..

## لێکچوانــدنی وێنــە

ئەم لێکچواندنانەی تا ئێستا باسمان کردن‌و نموونەمان بۆ هێنــــان هەموویان بریتی بوون لە لێکچواندنی تاك ، واتـــە شتێك بە شتێکی‌تر . لێرەدا باسی جۆرە لێکچواندنێکی‌تر ئەکەین کە ( لێکچواندنی وێنە )یــە . لەم جۆرەدا لە جیاتی ئەوەی شتێك بە شتێکی‌تر بچوێنرێ ، وێنەیەك بـــە وێنەیەکی‌تر ئەچوێنرێ . مەبەست لە وێنە ئەوەیە لە چـــەند پارچەیەکی زۆر پێك هاتبێ‌و ئەو پارچانە بە رەنگێکی وا تێك هەڵکشابن کە بووبن بـــە یەك شت‌و وێنەیەکیان دروست کردبێ .. ( نالی ) ئەڵێ :

زولفـت ســـەبەبە دڵ بە عـوزارت کە دەســـووتێ
ســـووچی شـەوە وا قاتلی پەروانە چرایــــــە

ئەڵێ : چۆن تاریکی شەوە ئەبێتە هۆی ئەوە چرا پەروانە رابکێشێ‌و بسووتێنێ ، هەر بەم چەشنە زولفی رەشی تۆ ـ یارە نازدارەکەم ـ بۆتــە هۆی ئەوە کە روومەتی گەش‌و رۆناکت دڵم بســووتێنێ ، چونکە ئەو کاتەی پەردەی زولفت بەسەر روخسارا بڵاو ئەبێتەوە رۆژی روخسار ئەکەوێتــە

پەنەوەی ڕۆشنایی لە دونیادا چت نەیب ، جا لەولو ئەم دونیا تاریکەدا دڵی گڕگرتووم بە شوێن ڕۆناکیێ ئەگەڕێ لەپڕ لە ڕوخسارت ڕاست دێتو ئەوەندە بە دەوری یا خول ئەخوا تا ئەبێ بە خۆڵەمێش !

(نالی) وێنەیەکی دیوە «زولفە ئەیتە هۆی سووتانی دلی بە ئاگری رووەوە» جا ئەم وێنەیە بە وێنەیەکیتر ئەچوێنێ کە باوترە ئەویش ئەوەیە : « شەوە ئەیتە هۆی سووتانی پەروانە بە گڕی چرا ․» لەم دوو وێنەدا لێکچواندن نەکەوتۆتە نێوان (زولفو شەو) بە تەنها ، نەشکەوتۆتە بەینی (دڵو پەروانە) بە جیا ، هەروەکو نەشکەوتۆتە میانەی ڕوخسارو چرا ․․» ڕاستە ئەتوانین زولف بکەین بە شەو لە ڕەشیدا ، ڕوو بکەین بە چرا لە گەشیدا ، دڵ بکەین بە پەروانە لە گەڕانو سووڕانا بەلام (نالی) مەبەستی ئەم تاکە تاکانە نیە ، بەڵکو مەبەستی ئەم وێنانەیە کە لە پشت ئەم تاکە تاکانەوە هەن ․․ کەواتە لێکچواندنی وێنە ئەوەیە وێنەیەك بە وێنەیەکیتر بچوێنرێ کە هەریەکە لەم دوو وێنەیە لە چەند پارچەیەك پێك هاتبێو مەبەستیش پارچەکان نەبێت بەڵکو ئەم وێنەیە بێت کە پارەکان دروستیان کردووە ․ یا (حەریق) ئەڵێ :

پێی بلێن زاهید بە خێری خۆی لە وەعزی من گەڕێ
عەشقی من شوعلەو بلێسە ، وەعزی ئەو وەك خارو خەس

( حەریق ) لەم لێکچواندنە بەرزەدا (عەشقی دڵی خۆی) بە (گڵپەو بلێسەی ئاگر) ئەچوێنێ ․ (پەندو وەعزی واعیز) بە (خارو خەس ـ دڕكو داڵ) ئەچوێنێ ․․ بێگومان ئەگەر مەبەستەکە هەمووی هەر ئەوەندە بێت باناێ وایە ئێمە ئەگەیشتین بە هیچ ، بەلام (حەریق) مەبەستی ئەوە نیە کە بە تەنها عەشقی دڵی خۆی بکا بە شوعلەو بلێسە ، وە وەعزی واعیز بکا بە دڕكو داڵ وبەس بەڵکو لەو دیو ئەو تاکە تاکانەوە وێنەیەك پەیدا ئەکرێ ، دیمەنێك ئەکەوێتە بەر چاو ، ئەویش مەبەستی ئەو وێنەو دیمەنەیە !

حەریق ئەو دیمەنە ئەخاتە پێش چاو کە چۆن ئاگرێك ئەگەر (کلبەو بنیـەی) بەرزبێتەوە دەر بپەڕێنە پووش‌و پەڵاش، سەر ئاگرەکەو ئەیکاتە بخەیتە سەر بە نیازی کپ کردنەوەی لە لایێ ئاگرەکە بەو پووش‌و پەڵاشە خۆشتر ئەبێت‌و لە لایەکی تریشەوە، ئاگرەکـە ئەم پووش‌و پەڵاشە هەڵ ئەلوفێ‌و قووتی ئەدا جا ئەڵێ عەشقی دڵی منیش وەکو ئەو ئاگرە بلێسەی ئەبوا بە ئاسمانا، وەعزو پەندو ئامۆژگاری واعیزیش وەکو پووشەکـە وایە، ئەیەوێ بەو وەعزانە گڕی دڵم دامرکێنێتەوە بەڵام نازانێ کە بەپێچەوانە ئەکا بەئاگرا نازانی ئەم وەعزو ئامۆژگاری‌یانە لە لایێ گڕی ئەم عەشقەم لە دڵا خۆشتر ئەکەن‌و لە لایەکی تریش عەشقی من وەعزەکـــا ئەخوا نـاهێڵـێ [1] .

لێکچواندنی وێنە زۆر جۆری هەیە لەوانە :

١ ـ ئەوەیە کە تەنها مەبەست روون کردنەوەو پێشاندانی وێنەکی بێت‌و نەگونجێ تاکە تاکە وێنەکان بە یەك بچوێنرێن وەکو

شێر کە هات گیرۆدە بوو سەد نەعرەتەو ناڵەی بەهیچ

عاقڵێك گوێی لێ ئەگیرێ پیری سەد ساڵەی بە هیچ

لێرەدا راستە مەبەست پێشاندانی وێنەکەیە بەڵام کە سەیری پارەکانی ئەم لاو ئەو لا ئەکەین بۆمان دەرئەکەوێ کە ناگونجێ تاکە تاك بە یەك بچوێنرێن، لێکچواندنی پیاوی عاقل ناکرێ بە شێر، بەڵکو پیاوی ئازاو بە جەرگ بە شێر ئەچوێنرێ، (پیری سەد ساڵە) ناکرێ بە ( نەعرەو ناڵە ) .. جا ذیارە لێرە هەر تەنها وێنەکان بە یەك ئەچن‌و بەس !!

---

(١) ئەم لێکچواندنەی حەریق زۆر لەوە ئەچێ کە ( احمدی خانی ) لە (مەم وزینا) هێناویە ئەڵێ :

عەشق ئاگرە نەفخەیە نەصیحەت    سر پەردەیە لۆمەیە فەضیحەت

سالمیش ئەم راستی‌یەی پێشان داوە بەڵام نەك بە لێکچواندن کە ئەڵێ :

دەس لە تۆ هەڵناگرم تا نەمکوژن    حەرفی ناصح سەر بەسەر ئەفسانەیە

٢ ـ ئەوەیە کە بکرێ تاکە تاکی وێنەکان بە یەك بچوێنرێن بەڵام ئەمەیان مەبەست نەبێ بەڵکو مەبەست پێشاندانی وێنەکە بێت و بەس ا حەریق ئەڵێ :

مجمعە سینە ، وەفنجان مەم وشەربەت دەم
خەلعەتی یارە کە زانیوە غەریبی وەتەنم

ئەڵێ کە یارەکەم منی بە ئاوارە دیوە ، هاتووە ئەم خەڵاتەی پێشکەش کردووم : چۆن خوان ئەڕازێنرێتەوەو شەربەت و فنجانی لەسەر دائەنرێ و پێش کەش ئەکرێ هەر بەم جۆرەش یارەکەم دوگمەی ترازانووەو سینەی خۆی بۆ کردوومەتەوەو مەمکی وەکو فنجانی پێشکەش کردووم شەربەتیشی بۆ ئامادە کردبووم کە ماچی لێوی بوو !!

لێرەدا ، وایە ، مەبەستی دەرخستنی وێنەکەیە بەڵام لە پاڵ ئەمیشەوە ئەگونجێ بە جیا جیا (سینە) بە (سنی) و (مەم) بە (فنجان) و (دەم) بە (شەربەت) بچوێنرێ .. لەم تێکچواندنە رەکاکەتێك هەیە چونکە راستە شەربەت ئەکرێتە فنجانەوە بەڵام کەی ماچی دەم ئەکرێتە ناو مەمکەوە بۆ ئەوەی ماچی دەم و مەمك بە شەربەتی ناو فنجان بچوێنێ .. یا وەکو گۆران ئەڵێ :

تۆو مەلاو شیعرو فەلسەفەی ئیسلام
گوێ راگرتنی تاو تاوی عەوام
بە بێ زیادو کەم دێتە پیش چاو
سەرنجی کوێران لە نامەی نووسراو

چۆن کوێر بە دیار نامەی نووسراوەوە ماتەڵ ئەبێت و تەقەی سەری دێت ، مەسەلەی تاو تاوی عەوامیش هەمان شتە کە گوێ بۆ شیعرو فەلسەفەی ژیان رائەگرن ..

## پەلە پەسەکی

تا ئێستا نەختێ بە فراوانی باسی جۆرەکانی لێکچواندنمان کــرد ، ئەوەمان ووت کە لە لێکچواندنی ئاوەژوو شوێنی لێچوو لەوچـــوو ئەگۆڕێ ، وا پێشان ئەدرێ کە ئاشکرایی سیفەتی لێچوو گەیشتۆتـــە رادەیەك کە گەلێ زیاترە لەوچوو ..

کە لێکچواندنیدوو شت ئەکرێ بە یەکتر هــەر ئەبـێ یەکێکیــان سیفەتەکەی پەسندتر بێ لە وەیتر چونکە کە ئەڵێی « ئەبرۆی وەکــو مانگی یەك شەوە وایە . » راستە ، لێرە ئەبرۆ بە مانگی یەك شـــەوە چوێنراوە بەلاَم لە هەمان کاتیشا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە مانگی یەك شەوە لە ئەبرۆ جوانترە بۆیە داوای ئەوە ئەکرێ کە ئەبرۆ وەکو ئـــەو لــێ بکـــرێ .

زۆر جار وا ئەبێ ئاویسترێ دوو شت لە لێکچوونا یەکێکیان لەوەی تر پەسندتر بکرێ بەلاَم ئەویسترێ کە (وەك یەکی) هەردوو لا پێشـان بدرێ وبــەلێنرێ ، ئەم هونەرەش پێی ئەووترێ (وەك یەکی ــ التشابه) لێرەدا مەبەستەکە ناخرێتە پەردەی لێکچواندن نەوەك بەمەوە پەســندی یەکێکیان بەسەر ئەویترا زاڵ بێت ، چونکە هەر دەم لێکچوون لە لەوچوو پەسندترە تا لە لێچوو . تەنیا لە لێکچواندنی ئاوەژوو نەبێ کە پەسندتر دەر ئەکەوێ .. لە (وەك یەکی) کە ئەڵێی : (گوڵ و روومەتی یار وەکو یەك وان .» هیچ درزێك نامێنێتەوە کە گوڵ لە رووی یار ، یا رووی یار لە گوڵ جوانتر دەر بکەوێ ، بەڵکو هەردووکیان لەیەك رادە ئەوەستێ و هیچ جیاوازییەك ناتوانێ خۆیان بخاتە نێوانەوە ، بەلاَم کە ئەڵـێی ( روومەتی یار وەکو پەڕەی گوڵە ) لێرەدا راستە ئەمانەوێ بە روومەتـا هەڵبڵێین بەلاَم ( ضمنا ) ئەوەی هەر تیایە کە ناگاتە گوڵ لە جـوانیدا ، کەواتە جیاوازییەك هەر ئەمێنێ لە نێوان (روومەت) و (پەڕەی گوڵ) .. یا کە ئەڵێی : « پەڕەی گوڵ وەك روومەتی نازکی یار وایە » ئاشکرایــە کە ( پەڕەی گوڵ) بە (روومەت) چوێنراوە ، ئەمەش لێکچواندنی ئاوەژووە

چونکە لە ڕاستیدا ئەبێ ڕوومەت بکرێ بە گوڵ .. جا لە دوو توێی ئەم لێکچواندنە وامان بۆ دەر ئەکەوێ کە ڕوومەتی یار لە گوڵ نازکترە :
کەواتە لێرەش یەکسانیو وەك یەکی هەر دەست ناکەوێ ، کە چاوێـك بە (وەك یەکی) و (لێکچواندنی ئاوەژوو)دا ئەخشێنین بۆمان دەر ئەکەوێ کە لە (وەك یەکی‌دا) هەر ئەوەندە هەیە دوو شتەکە ئەبن بە یەكو هیچیان لە هیچ پەسندتر ناکرێ ، بەڵام لە لێکچواندنی ئاوەژوودا لێچوو گەلێ پەسندتر پیشان ئەدرێ .. لە (وەك یەکی)دا نالی ئەڵێ :

عەرعەر عەدیلی قەدیەتی یەعنی بەرابەرن

سونبول شەبیهی زولفیەتی فەرقی نی‌یە موێ

کە عەرعەرو قەدی یار بەرانبەر یەك دائەنێ مانای وایە هیچ جیاوازی‌یەکیان لە نێواندا نامێنێ ، هەروەها کە زولف ئەکا بە سونبول لێی ناگەڕێ بەڵکو دوا بەندی بۆ دێنێتەوەو ئەڵێ : (فەرقی نی‌یە موێ) واتە هەردووکیان بێ جیاوازی یەك شتن ..

## مەبەست لە هێنانی لێکچواندن

بێ گومان لێکچواندن پیشەیەکی ڕەوانبێژی بە کاریگەرەو کە ئەهێنرێ بۆ مەبەستێك یا چەند مەبەستێکی تایبەتی ئەهێنرێ هەموو مەبەستەکانیش بۆ (لێچوو) ئەگەڕێنەوە کە شادەماری لێکچواندنە ، ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە :

١ ـ دەرخستنی گونجانی لێچوو :

ئەمەش وا ئەبێ ئەو کاتەی نووسەر یا هۆنەر قسەیەك ئەکات نەختێ پێچەوانەو سەیر بکەوێتە بەر چاوو هەموو ئەقڵێك بە ئاسانی وەری نەگرێ، جا لەو کاتەدا دێ ئەو شتەی مەبەستیەتی بە شتێکی‌تر ئەچوێنێ بۆ ئەوەی پەردەی گومانی نەگونجانەکە لابدات .. وەکو (کامەران) ئەڵێ :

ئەگەرچی شەماڵ نـــەرمو نیـــانە    پەڕی گوڵاڵەش هەڵئەوەرێنــێ

چاوی تۆش گەرچی ئارامی گیانـــە    بەڵام پزیشکی دڵ ئەسووتێنـــێ

(کامەران) گەر هەر ئەوەندە بڵێت : «چاوی تۆ ئارامی گیـــانەو پزیشـکیش دڵ ئەسووتێنێ » ڕەنگە ئەم داوایە نەچێتە هەموو دڵێکـەوە، ڕەنگە بووترێ : « چاوی کە ئارامی گیان بێت چون دڵ ئەسـووتێنێ ؟ یا کە دڵ ئوسـووتێنێ چون ئارامی گیانە ؟ ئارام گرتنو سووتان چۆن لـە گیانو دڵا پێکەوە ئەگونجێن ؟ » واتە قسـەکە پێچەوانەیەکی لێ بـەدی ئەکرێ جا بۆ ئەوەی کامەران ئەم پێچەوانە نەهێڵێو بـەڵێنێ کە چاو ئارامی گیانەو دڵیش ئەسـووتێنێ ، دێ ئەم چاوە بە شەماڵ ئەچوێنـێ ، چۆن شـەماڵ نەرمو نیانە لەگەڵ ئەوەشا پەڕی ناسکی گوڵاڵە هـــەڵ ئەوەرێنێ بەم تەرحەش چۆن شـەماڵ نەرمو نیانە ئاواش چـاوەکە ئارامی گیانە وە چۆن ئەویان پەڕی گوڵاڵە هەڵئەوەرێنێ ئەمەیان پزیشکی دڵ ئەسـووتێنێ . لێرەدا مادام ئــەوە بگونجێ کە شەماڵ سـەرەڕای نەرمو نیانی پەڕی گوڵاڵە هەڵبوەرێنێ ئاواش ئەبێ بگونجێ کە چاو لەگـەڵ ئەوەی ئارامی گیانە پزیشکە بە هێزەکەی دڵ بـــسووتێنێ ، یا وەکــو ( نـالی ) ئــەڵێ :

بۆچـی ئەگریـــم ســەد کەرەتـــم دڵ دەشکێنـــی

مەی بـــۆچ نەرژێ شـــووشە لەســـەد لاوە شـــکاوە

٢ ـ دەرخستنی دۆخی لێچـــوو :

ئەوەش ئەو کاتە ئەبێ کە سـیفەتو دۆخـی لێچـوو کـز بـێ بەڵام سیفەتی لەوچوو باوی هەبێ . جا نەبەستیش لە لێکچواندن ئــەوە بێت کە لێچوو لە شێوەو دۆخی لەوچوو دابڕێژرێ . وەکو (حەریــق) ئەڵـــێ :

بـۆ گوڵـی رووت هاتـمو پەرچـەم دەبینـم بۆیـە وا

ماهی نەورۆزم بـە شیوەن وەك محـرم خۆی نوانـــد

ئەڵێ : چۆن بۆ گوڵێ رووت ئەھاتم لە پڕ پەرچەمی رەش سەرەڕێی لێ گرتم ! ئاواش مانگی نەورۆزم کە سەر دەمی گوڵو رێحانەو سەرەتای ژیانێکی پڕ ئارایشی نوێیە بە شێوەنو گریانو ئازارەوە بوو ؛ (محرم) ٠

ئەمە جگە لەوەی باری رووی یارو پەرچەم پیشان ئەدا لە هەمان کاتیشا بارێکی دروولێو هۆڵمانی شاعیرمان بۆ روون ئەکاتەوە !! کە لەو کاتەدا تێدا ژیاوەو پاڵی داوە بۆ ئەوەی پەیوەندییەك بخاتە نێوان ئەو بارە هۆڵمانییە تایبەتییەی ئاوەوەو سروشتی دەرەوە ٠٠

بۆ بەجێ هێنانی ئەم مەبەستە (کە دەرخستنی دۆخی لێچوو)ە چاکتر وایە لەوچوو شتێکی هەستپێکراو بێت تا زوو وەربگیرێو باشتر بچەسپێ !!

٣ ـ دەرخستنی ئەندازەی بە هێزی یا بێ هێزی لێچوو :

ئەوەش وا ئەبێ ئەو خاسەوێژەی کە ئەویسترێ ساغ بکرێتەوە بە سادەیی بزانرێ ، واتە گوێگر ئەزانێ خاسەوێژەکە هەیە بەڵام پلەی بە هێزی ئەم خاسەوێژەی لا روون نییە ، (نالی) ئەڵێ :

تیژاوی سروشکم وەکو ئیکسیری سوهەیلە
روخسارەی زەردم وەکو ئەوراقی خەزانە

٤ ـ چەسپاندنی لێچوو لە مێشکی گوێگردا :

ئەو مەبەستەش زۆرتر ئەو کاتە دێ کە شتێکی بزوێنی ـ معنوی ـ بەشتێکی هەستی بچوێنرێ وەکو :

هۆشم وەکو خۆم سەر لێشێواوە
لەسەر جوابێکی تۆیە داماوە

ئەم جۆرە لێکچواندنەش گەلێ بە هێزو دڵکێشە چونکە (گوزارەو ماناى ژیری ئەگەرچی چەسپاوەو ناگۆڕێ بەڵام بەراوردکردنی لەگەڵ شتی هەستیو پێکچواندنیان باشتری ئەچەسپێنێو دای ئەڕێژێ ٠

٥ ـ [illegible]

لێرەدا نووسەر یا هۆنەر لێچوو ئەگرێ و بە هەموو توانایەوە ئەیڕازێنێتەوە بە بە جۆرێکی وا کە گوێگر یا خوێنەر چەشەی لەگەڵ بیزوێ و دڵی بەسەرەوە بێشێ ، (کاکەی فەلاح) ئەڵێ :

سروشـــت بـە بەرگـــــی تـــاڵو وڵاوە

تـــازە بووکێکـــــە خـــۆی لە تەل داوە

کاکەی فەلاح سەرنجی لە سروشت داوە لە کاتی بەهارا ، ئەو کاتەی زەوی مافووری سەوزی خۆی ڕائەخات و دارو دەوەن گوارەی گوێکـە لە گوێ ئەکەن و بەفری کاوانی ئەم کوێستانە ئەتاوێتـەوەو شـاخە سەرکەوشەکان پێ لە پێتك ئەبن ، بۆنی عەنبەرێتی گوڵ و گوڵاڵە لەگەڵ هەوای فێنکی ئەم بەهارە تێکەڵ ئەبێ و ئەبێ بە هەناسەیەکی گیان بەخش !! لێرەدا شاعیر ئەو سروشتە ڕازاوەیە پیشان ئـەداو بـە تۆبووکێکـی ئارایشدراوی ئەچوێنێ ..

٦ ـ دزێـو کـردنی لێچوو :

ئەمەش لە خوسپ و داشۆرینا ئەبێ : شیخ رەزا ئەڵێ : رەنگی کەر ، دەنگـی بەقەر ، هەیبەتی سەگ ، خۆی چەقەل

## سـوودی لێکچواندن

لێکچواندن کە ئەهێنرێ سوودێك یا چەند سوودێکی لێ ڕەچـاو ئەکرێ ، ئەمانەش هەندێ لەو سوودانە :

١ ـ کورتبـڕی :

وا ئەبێ نووسەر یەوێ کۆمەڵە سیفەتێك بداتە پاڵ شتێ ، یا کەسێ ، جا کە پەنا ئەباتە بەر لێکچواندن بۆ ئەوەیەتی لە درێژدادڕی ڕزگاری بێ .

(پیرەمێرد) ئەڵێ

تاڤگــــەکەت ســـەربەرز ســـاردە وەك تـــەرزە
دانـــــەی مرواری لەنجـــەی ســـەد تـــەرزە

ئەوە هەر لێگەڕێ کە ڕەگەزدۆزی ـ الجناس ـ لە وشـــەی تەرزە کەوتۆتەوە کە دووجار هاتووەو هەر جارەی مانەیـەك ئـەدات . پیرەمێرد لە جیاتی ئەوەی بە دوورو درێژی بە تانو پۆی ئاوی تاڤگەکە بێتە خوارەوەو باسی ساردی بکات ، هاتووە بە دوو ، ووشە ماناێ تەواوی داوە بە دەستەوە « ساردە وەك تەرزە »

٢ ـ بۆ روون کـــردنەوە :

ئەمەیان شا نیشانەی لێکچواندنە چونکە یەکەم ئەرکو فەرمانـی لێکچواندن لابردنی گومانو دوودڵییە بەرامبەر ئەو شتەی ئەخرێتـە روو .. بۆیە یەکەم نەنگیو کەمو کورتی لێکچواندن ئەوەیە مەبەستەکەی پۆشراو بێت یا بە تەواوی روون نەکرایتەوە . (پیرەمێرد) ئەڵێ

جاهیـل زلیش بـێ وەك کـەندوی بۆشـــە
دەنـــگی دەهۆلیش هـــەر لـە دوور خۆشە

جاهیلی بە کەندووی بۆش چواندووە ، ئەمەش بۆ ئاشکرا کردنی مەبەستەکەیە ..

٣ ـ هووشـــەکاری :

کە شتێك بە شتێکیتر ئەچوێنرێ دیارە نیاز لەم لێکچواندنە ئەوەیە کە لێچوو لەسەر شێوەو دۆخی لەوچوودەر بکەوێ، ئەمەشیان هەڵبەت هووشەکاری گەرەکە ، ئەم هووشەکارییەش ئاوی گیانی هـــەموو لێکچواندێکـە ، کوردی ئەڵێ :

گـــەردنی کـوردی لە کێـوی بێستوون مەحکەمترە
چونکـە سـەد سـاڵە لە ژێـر باڵی خەمایەو ناتەوێ

کوردی گەردنی خـۆی کـردووە بـە کێـوی بێـستوون ، لێکچواندنەکەش پەسـندیدەیە .. چونکە کێوی بێستون لە کـوێ ؟ گەردنی زراوی لە کوێ ؟ جا هەرچی بلێیت دەربارەی ئەم هووشەکارییە هـەر هیچت نـەووتووە ..

٤ ـ داگرتـــنو جـەخـت کـردن :

کە لێکچواندنێك ئەکرێ مەبەسـت داگرتنو جەخت کردنی سیفەتی لێچووە ، کاکەی فەلاح ئەڵێ:

هەر کەســێ ئۆبالی ئیشی خۆی لەسەر ئەستۆیەتی
وەك برۆ چۆن پشتی چاوی گرتووە جـێی خۆیـــەتی

لێرەدا راستەقینەیەك هەیە : « هەر کەسێ ئۆبالی ئیشی خۆی لەسـەر ئەسـتۆیەتی . » جا بۆ جەخت کردنی ئەو مانایە هاتووە بە (برۆ)و پشـت چـاو گرتنی چواندووە ..

## پلەی کاریگەری لێکچوانـدن

لێکچواندن هەر جۆرێك بێتو بۆ هەر مەبەسـتێـك بێـت لـە کاریگەرو ئەنگافتنا سێ پلەی هەیەی :

١ ـ لێکچوانـــدنی رەوان :

ئەمەیان لە هەموو جۆرەکانیتر بە هێزترە ، تەنها لە لێچووو لەوچو دروست ئەبێ بەس ، ئەوزارو لێکچوون باسیان ناکرێت ، ئەوەش ئەبێ کە لەوچوو بکرێتە موزافو بدرێتە پاڵ لێچوو ، وەکو (بەهەشتـی دڵداری ، دۆزەخی دووری ، داری ئازادی ... »

٢ ـ پلـــەی نـاوەنجـی :

ئەوەیە کە تەنها نیچووی ئەوچوو یا [illegible]
بەس لێکچوون • کەواتە ئەم جۆرە یا (لێکچواندنی بەرەلا) ئەگرێتەوە ، یا ( لێکچواندنـی درێـژە ) ••

٣ ـ پلـــەی نـــزم :

ئەو لێکچواندنەیە کە هەر چوار بنەڕەتەکانی بە ئاشکرایی تیـــا بـاس کـــرابێ !

ئەمەو هەڵبژاردنی یەکێ لەم جۆرە لێکچواندنانە ئەچێتەوە ســەر چەشەی نووسەرو شوێنیش پێشەی ڕەوانبێژی ڕائەکێشێ •!

## لێکچواندنی زۆر لە دێرە هۆنراوەیـــەکا

زۆر جار وا ئەبێ کە هۆنەر لە دێرە هۆنراوێکا چەند لێکچواندنێك دێنێ ، ئەمەش چەند نموونەیەك :

١ ـ لێکچواندنی یەك شت بە یەك شت : صافی ئەڵێ :

یار لەبـەر نازی جوانی مامـزە ســـارەم دەکـــا
یا لـە نالەی عاشـــقانە ڕوو لە عالـەم کـەم دەکـا

٢ ـ دوو شت بە دووشت : مەولەوی ئەڵـێ :

نـە شـــــەو ڕاحەتـم ، نـبـــە ڕۆ دڵشــــادم
شـــــەو زولف ، ڕۆ ڕووت مەوزۆ ئـەو یــــادم

٣ ـ سێ بە سێ شت : (نالی) ئەڵێ :

ئاســمانی حوسنی حەبیبـم لە ئەبرۆ زولفو ڕوو
دوو هیلالو دوو شـەوو دوو ماهی تابالـی هەیـــە

٤ ـ چوار شت بە چوار شت : ( حاجی ) ئەڵێ :

نەسرین کێوم ، سەرم شەمامە ، هەناسەم

نەسیمە ، چاوەکانم ئەستێرەن لەم

٥ ـ پێنج شت بە پێنج شت : (ناری) ئەڵێ :

رووت وەکو ئاگر موژەت وەك شیشە ، ئەبرۆت قیمەکێش

مرومحەت زولفو کەبابت جەرگی پارەی نارییە

٦ ـ شەش شت بە شەش شت : ئەدەب ئەڵێ :

بە زولفو برۆو موژگانو خەتو پەرچەمو بالآ

کەمەندو تیغو تیر ، جەوشەنو خەفتانو والایی

بە کولمەو رووومەتو ران بە مەمکو سینەو گەردن

عەقیقو لەعلو یاقووتو دوورو بلووورو مینایی

٧ ـ حەفت شت بە حەفت شت : (کوردی) ئەڵێ :

کەبك خەتو باز رەوشت ، سەقەر سەدا ، پەیجە عوقاب

چاو مەڕاڵ ، ئاسك نیگە ، شێر کەمەن ، سمت غەزاڵ

## رەوانی لێکچواندن

رەوانی لێکچواندن لەوە دایە نووسەر وێنەی شتێکی دوورو شاراوە بێنێتو بە هۆی شتێکی دیارو نزیکەوە دەری بڕێو پێشانی بدا ، جا هەر چەندە ئەو گواستنەوەیە لە لێچوو بۆ لەوچوو دوورو قوڵتر بێ لێکچواندنەکە ئەنگیوتر ئەبێ .. « چاوی کاڵ ئاسا لێکچواندن تەلەسمو راکێشانو مەبەست بەخشی تیایە ، بەندی دڵو رشتەی جەرگ رائەهەژێنێو ئەی خاتە جۆشو خرۆشەوە .. » (١)

دیسان رەوانی لێکچواندن لەوەوە دەرئەکەوێ پەردەی لێلو پێلی شت دابدڕێو وێنەو دیمەنێکی دڵ راکێشەر بخاتە بەرچاو ، ئەمەشیان

(١) اسرار البلاغة فی علم البیان

[illegible] لە [illegible]یکی تیژر [illegible] [illegible]
دەرچووبێ شتەکە پەسندترو دلگرتر ئەبێ ا . عبد القاهر الجرجانی گوتەنی
هەر لێکچواندنە ئاوو ئاگر پێکەوە کۆ ئەکاتەوەو شتێ بێ گیان وە دەنگ
دێنێ .. وەکو ئەدەب لە دووری یاری ئاگری لە دڵ بەر ئەبێ‌و دەریای
فرمێسکی لە چاوەکانا سەر ئەکا وئەڵێ :

شەو لەبەر سۆزی دەروونو ئەشکی دیدەم نازەنین
لایەکی ئاوی رەوانو لایەکی نارە ئەدەب

بێ‌گومان هەر لێکچواندنە بتوانێ ئاوو ئاگر پێکەوە کۆ بکاتەوەو
وا لە ئەدەب بکا کە لە دەرەوە نوقمی دەریای فرمێسك بێ‌تو لە
ژوورەوەش دەروونی کوورەی ئاگرێکی بە جۆش بێت ..

ئەگەر بێ‌تو بلێیت ( فلان وەکو فلانە لە درێژی‌دا ) یا (زەوی وەکو
تۆپ خڕە) یا « ئەو کاغەزە ئەوەندە سپی‌یە سەد سوێند ئەخۆی بەفرە ..
بێ‌گومان ئەم جۆرە لێکچواندنانە هیچ بۆنێکی رەوانبێژی‌یان لێوە
نایەت ، چونکە لێکچوونەکە زۆر زۆر دیارو ئاشکرایە ، هیچ قوولی‌یەکی
تیا نی‌یەو پێویست بە لێکدانەوە ناکات ، خەیالەکەی تەسکەو نەیتوانیوە
پەڵ باوێ ، بەڵام هونەرمەند ئەو بلیمەتەیە کە بیری ووردی ئەخاتە کارو
ئەم لێکچواندنە دادێنێ :

گیانە لە پرخەی خەوی خاومدا
پێنت بنێ وەبیان هەردوو چاومدا
مەڵێ بەرژانگت تیژە وەك چقل
ئەچەقێتە پای نازکتر لە گوڵ

ئەمە کە یارانی وتوویەو پیرەمێرد کردوویە بە سۆرانی ئەو
پەڕی جوانی تیایە ، بۆرانگی خۆی ئەکا بە چقل ، یا ـ پێ ـ ی ناسکی
یار ئەکا بە گوڵ ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو جوانی لە وێنەو دیمەنەکە دایە
کە خەیالی هۆنەر دروستی کردووە کە خۆی لە پرخەی خەوا بێ‌تو
یارەکەی بە پێیە گولینی‌یەکەی بە سەر چاوی بکەوێ ، سەرەرای ئەوەش

ئەڵێ من ئازارکێش نابم بەڵام خەمی تۆیە ئەی یارە نازدارەکەم کە
[illegible] ..

ئەوەی لەم لێکچواندنە سەرنج رائەکێشێ ئەوەیە خەیاڵی بۆ ئەوە چووە پێی ئاسکی یار بە گوڵ دابنێو هەستیش بەوە بکا کە بۆ ئەم پێ ئاسکە برژانگی ئەو وەك چقڵ وان ، ئاسکی پێو تیژی برژانك ئەو پەڕی جوانی ئەنوێنێ ، هەر وەکو هۆنەر لە ریزکردنو دارشتنی ووشەکان دەستێکی باڵای هەیە ، کە ئەڵێ ( پرخەی خەوی خاو ) پیاو دڵو دەمارەکانی خاو ئەبێتەوەو هەست بە نەرمیو هێمنی ئەکا .. ئەمە لە شوێنی نەرمیدا بەڵام لە شوێنی توندو تیژی دا « چقڵ ئەچەقێتە » دێنێ کە زۆر توندو لە جێیە.

بە کورتی رەوانی لێکچواندن لە دوو لاوەیە

١ ــ لە رێختو دارشتنو هێنانی ووشەی جێگر ! بە جۆرێ هەر یەکە جێگەی خۆی بگرێ کە بە تەواوی خوێنەر سەراسیمە بکەنو دڵی لێ بسێنن ..

٢ ــ لە داهێنانو دۆزینەوەی لەوچوونێکی دوورو گونجاو کە کەم زەین بەدی بکات لە باری ئاسایدا ، ئەمەش پێویستی بە بەهرەیەکی لە خەرەك دراو هەیە بۆ ئەوەی باڵندەی خەیاڵ وەکو بازی چوستو چەش بکەوێتە فڕین لەو پەڕی ئاسماناو لێکچوونێکی جوانو دروست بەدی بکاتو دای بهێنێ !

جگە لە مەش بیروباوەڕ کارێکی زۆر ئەکاتە سەر بەهێزیو بێهێزیو یا رەوانیو نارەوانی لێکچواندن چونکە ئەو شتەی کە پیاو باسی دەکاتو بە لێکچواندن ئەی خاتە روو تا زیاتر باوەڕی پێ بێت لێکچواندنەکە بە هێزتر ئەبێ چونکە لە سۆزو بیرو باوەڕێکی پتەوەوە دەرهاتووەو کەفو کوڵی جۆشێکی راستەقینەی دەروونێکی پڕ شۆڕو شەڕە ..

## بەشی دووەم

## دروست‌و خوازە ـ الحقيقه والمجاز ـ

هەر ووشەیەك لە هەر زمان‌و شێوەیەك داو بەلای هەر نەتەوەو هۆزێکا کە دانراوە بۆ مانایەکی تایبەتی دانراوە جا دروست ـ الحقیقة ـ بریتی‌یە لەو مانایەی کە ووشەکە لە بنچینەدا بۆی دانراوە بێ هیچ پێچ‌و پەناو عێبان‌و بردنێك لە پەخشانا شاکر فەتاح ئەڵێ

« لە گەلێ وەختا ئافرەتی کورد پێشانی داوە کە لە چوستی‌و چالاکی‌و زرنیگی‌و دەسەلات‌و فەرمانڕەوایی‌و نیشتمان پەروەری‌و خوێندەواری‌و دلەڕی‌یا لە پیاو کەمتر نەبووە ، قەدەم خێرو قەرەفاتم دوو سەر کۆماری ئازاو بە جەرگ‌و بە ناوبانگی کوردستانی رۆژ هەلات‌و کوردستانی ژووروو بوون ... »

ئەگەر بە ووردی سەیری ووشەکانی ئەم دەقە بکەین بۆمان دەرئەکەوێ کە هەر ووشەیەك بۆ مانای دروست‌و تایبەتی خۆی دانراوە .. فەرهەنگی کوردی بێنەو لێکی بکەوە ـ گەوەی هەیە ـ سەیری ئەم ووشانە بکە ئەبینی لێرەدا هەمان مانا ئەگەیەنن کە لە فەرهەنگا هاتووە .. هیچ ووشەیەك بۆ مانایەکی‌تر نەخوازراوە جا ئەو مانایەی بە ووشەی دروست‌و تایبەتی خۆی دەر ئەبڕێ پێی ئەووترێ ( مانای دروستی ووشە ـ المعنی الحقیقی للکلمة ) لە هۆنراوەشا پیرەمێرد ئەڵێ :

کچە ووتی : ئەوە ئەستێرەیەکی تازە هەلات
بە کوردی ناوی گەلاوێژە ، شەوقی دایە وولات
وەرە بە شوعلەی ئەو سوێند بخۆین کە یەك دڵ بین
لە خزمەتی وەتەنا هەوڵ بدەین هەتاکو دەژین

لێرەش ئەم ووشانەی هاتوون هەر مانای دروستی خۆیان ئەگەیەنن وبەس !

# بەشــەکانی دروســت

زاناکان لەو باوەڕەدان کە دروست سێ بەشە :
دروستی زمانی ــ دروستی نەریتی ــ دروستی دەستووری ٠

## ١ ــ دروســتی زمـــانی :

ئەو ووشانە ئەگرێتەوە کە لە گەڵ پەیدابوونو پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەك هەریەکە بۆ دەربڕینی مانایەك یا شتێك دانراوە وەکو گوڵ ، چیا ، بروسك ، باران ، ئاو ، مانگ ...

خۆ ئەگەر ئەم ووشانە بۆ دەربڕینی مانایەکیتر بێجگە لە مانای خۆیان بە کار بیرێن ئەوا ئەبێ بە خوازە ــ المجاز ــ وەکو مانگ کە ئەو جورمە ئاسمانییەیە بەدەوری زەمیندا ئەسوڕێتەوە بەڵام دوور نییە ئەم ووشەیە بۆ دەربڕینی مانەیەکی تر بخوازرێ وەکو ( کە زولفی لاکەوت مانگــێ کەوتەدەر ٠ ) بێ گومان لێرە مانگ بۆ مانای دروستی خۆی نەهاتــووە بەڵکو مەبەســتروخسارو کولـە !
خوازەش هەر ئەبێ لە دوای دروستەوە بــێ ، چونــکە لە پێشــا ووشـەکە بۆ مانایــەك دانراوە ، پاشــان هــەمان ووشە بۆ راگــەیاندنی مانایەکیتر خوازراوە .. لە هەمان کاتیشا ئەگەر ئێمە ووشەیەك بە رەقو رووتی بینین ناتوانین فەرمانی بەسەرا بدەین کە ئەم ووشەیە دروستە یــا خوازە ! چونکە دروستی یا خوازەیی لە بەکارهێنانا دەرئەکەوێ ..

## ٢ ــ دروســتی نەریتــی :

ئەوەش وا ئەبێ ماناى دروستی ووشە لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانو بردنا لە ناو خەڵکا بگۆڕێو بێ بە شتێکیتر ، بەڵام نەك لەسەر حیسابی خوازە بەڵکو لەسەر ئەرکی دروستەکەوە ٠ واتە ماناکە هەر دروستەو نابێ خوازە .. ئــەمەش دوو جــۆرە :

أ ــ نەریتی تایەتی : ئەوەیە کە پسپۆری زانیارییەك یا کار کردەی کارێك یا خاوەنی پیشەیەك ووشەیەك لە مانای بنەڕەتی دائەبڕنو ئــەی کا

به زاراوه بۆ شتێکی تر وەکو (زەبر ــ عزم‌چڕی ــ الکثافة ، بارستایی ــ الکتلـه ، توان ــ الاس ) ئەم ووشانە هەر یەکە مانای دروستی خۆی هەیە بەلأم لەسنووری زانیاری‌دا هەر یەکەیان مانایەکی تایەتی ئـەدا ، ئەو مانەیەش کە لە زانیاری‌دا ئەی دەن هەر بە دروست ئەژمێردرێ .

ب ــ نەریتی گشتی : ئەوەشـس دوو جۆری هـەیە یەکەم وا ئـەبێ بەکارهێنانی خوازە ئەوەندە باو بێ وەکو دروستی لێ بێت ، هەروەکـو فڕێ دانی موزافو دانانی موزاف الیهی لە شوێنی ئەوەوە وەکو بلێی « مەی حەرامە » لە راستی‌دا (خواردنەوەی مەی حەرامە ) ، جا لەبـەر ئەوەی ئەم خوازەیە ( مەی حەرامە ) لە دروستەکە باوترە ، ئەم بووە بـە دروست . جۆری دووەم ، بریتی‌یە لە دابڕینی ناوێکی گشتی بەسەر یەکێ لەو شتانەی بەری ئەکەون وەکو ووشەی ( وولآخی بەرزە ) راستـە ئەم ووشـەیە هەموو وولآخێکی بەرز ئەگرێتەوە بەلأم ووردە ووردە ماناکەی گۆڕاوە تا مانای دروستی بەجێ هێشتووەو بە تایەتی بۆ ( هێـتر ) بەکار دێ ، یا وەکو ( رەشە وولآخ ) کە هەموو وولآخێکی رەش ئەگرێتـەوە بەلأم بۆ مانگا بە کاردێو بـەس .

٣ ــ دروستی دەستووری : ئەو ووشانەیە کە بۆ دەستووری ئایـن‌و یاساو رژێمی یاساو رژێمی وولآت دائەنرێن ، ئەمەش وا ئەبێ خوسپ‌و هەڵتان هەلئەگرێ وەکو ، ئیماندار ، گاور ، دەروێش ،...
یا وا ئەبێ خوسپ هەڵتان ناگرێ وەکو ( نوێژ ، رۆژوو ، شەشەران ..)

ئەمە دەربارەی دروست ــ الحقیقة ــ وە ئێمـە کە لێرە باسمان کرد مەبەستمان ئەوە بوو کە بە هۆی ئەوەوە لە خوازە ــ المجاز ــ بگەین ــ..

## خوازە ــ المجـــاز ــ

وەکو ووتمان خوازە بریتی‌یە لەوە کە ووشەیەك بۆ مانای دروستـی خۆی بەکار نەبرێ بەلکو بۆ مانایەکی تر بخوازرێو مەبەسـتێکی تـر بگەیەنێ .. احمد مختار بەگی جاف ئەلێ :

له خەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەو زەمەرتلنیە
هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزلو هونەرتانە

که ئەڵێ (له خەو هەستن) بێ گومان خەو بۆ مانای دروستی نەهاتووه که نووستبە بەڵکو بۆ دەربڕینی مەبەستێکیتر به کار هاتووه که غەفلەتیو بێ ئاگاییە .. خوازه به شێوەیەکی گشتی دوو جۆره :

١ ـ خوازەی زمانی : ئەوەیە ووشەیەك نه مانای راستەقینەی دەربڕ بخرێتەوەو بۆ راگەیاندنی واتایەکیتر بەکار بیرێو پەیوەندییەکیش لە نێوانی مانای دروستو مانای خوازەیی وشەکەدا هەبێت ، ئەوەش دوو جۆره :

أ ـ خواستن : ئەو خوازەیەیە که پەیوەندییەکەی لێکچوون بێت .

ب ـ خوازەی بەرەلا : هەموو خوازەیەکی تری زمانی ئەگرێتەوه که پەیوەندییەکەی وێچوون ـ مماثلة ـ نەبێ ، بۆیەش پێی ئەووترێ خوازەی بەرەلا چونکه به پەیوەندییەکەوه نه بەستراوه ، یا لەبەر ئەوەیه که پەیوەندییەکانی ئەکەونه نێوان مانای دروستو مانای خوازەیی وشەکه ئەوەندە زۆرن له ژمار نایەن .

٢ ـ خوازەی ژیری :

## ١ ـ خوازەی زمانی

خوازه بریتییه له بەکار هێنانی ووشەیەك بۆ دەربڕینی گوزارەیەکیتر بێجگه له گوزارەی تایەتی خۆی ئەمەش سەبارەت بە پەیوەندییەکەوه که له میانەی گوزارەی دروستو گوزارەی خوازەیی ووشەکەدا هەیه لەگەڵ هەبوونی نیشانەیەکی زمانی ـ لغوی ـ یا ژیری ـ عقلی ـ که بەرهەڵستی مانا دروستەکە بێت ، ئەم نیشانەیەش پێی ئەووترێ (قرینه المجاز) .. وەفایی ئەڵێ :

گوڵەکەم دەڵێن ئەوا دێ هەموو وەختێ چاوه چاوم
لەی خودا تۆ باسی وەها بێتەوه رۆنایی چاوم

لێرەدا له جیاتی ئەوەی وەفایی به ووشەی دروستو راستەقینە

بڵێ : « یارەکەم دەڵێن ئەوا دێ» بە جۆرێکی تر دەربڕێ [illegible]
«گوڵەکەم دەڵێن ئەوا دێ» واتە راستەو خۆ ناوی یاری نەبردووە وای بە چاك زانیوە کە ووشەیەکی تر بە کار بێنێ ، لە (گوڵ)یش پەسندترو لە یار وەشاتری نەدیوەتەوە بۆیە ناچار بووە ووشەی (گوڵ) بەنازی بۆ دەربڕینی یار .. گوڵ دوو مانای هەیە : یەکی دروست کە ئەو گوڵوکە بەهاری‌یە رەنگاو رەنگ‌و بۆن خۆشەیە کە لە گەرمەی بەهارا دەم ئەکاتەوەو بۆن‌و بەرامە بڵاو ئەکاتەوە ، مانای دووەمیشی دلخوازی خۆیەتی ، جا لێرەدا وەفایی مەبەستی مانا خوازەیی‌یەکەیە کە یارە نەك گوڵی راستەقینە ، نیشانەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئەڵێ (دەڵێن ئەوا دێ) : هەڵبەت گوڵی راستەقینە توانای بزووتن‌و هاتنی نی‌یە مەگەر بە دەم شنەی باوە لە جێوە بجووڵێتەوە ئەگینا هیچ .. بۆیە هاتنی زۆر ستەمە بەڵام هاتنی یار کە ووشەکەی بۆ خوازراوە زۆر لەگێن‌و نزیکە ، کەواتە ئەمەیان ئەبێ بە نیشانەو رێگای ئەوەمان لێ ئەبڕێ مانای راستەقینەمان مەبەست بێت‌و بەرەو مانا خوازەیی یەکە رامان ئەکێشێ .

## خواستن ــ الاستعارە

خواستن بریتی‌یە لە بەکار هێنانی ووشەیەك بۆ دەربڕینی مانایەکی‌تر بێجگەر لە مانای دروستی ووشەکە بە مەرجێ پەیوەندی نێوان مانای دروست‌و مانای خوازەیی ووشەکە وێچوون بێت ، ئەبێ نیشانەیەکیش هەبێ کە ئێمە مەبەستمان بەم ووشەیە مانا خواستراوەکەیە نەك مانا دروستەکە . (ئەدەب) ئەڵێ :

گەهـ لـە باخی سینەدا سەیری دوو نارنجم دەکرت
گەهـ لـە گوڵزاری جەمالی تەماشای یاسەمین

( نارنج ) مانای دروست ناگەیەنێ کە بەری دارێکە ، بەڵکو بۆ شتێکی تر خواستراوە کە (مەمك)ە . پەیوەندیش لە نێوانی (نارنج)و (مەمك) وێك چوونە ، کە مەمك زۆر بە نارنج ئەچێ .. نیشانەش بۆ ئەوەی

[illegible]
ئەلێ ، (لە باخی سینەدا ) ، بێ گومان سینگی یار هەر مەمکی لەسەرە کە
لە نارنج بچێ ..

ئەرەستۆ دەربارەی خواستنەوە ئەلێ : « هۆمیرۆ ئەگەر بلێ
ـ ئەسپەکە وەك شێر هەڵمەتی برد ـ ئێمە بەرابەر وێنە یا لێکچواندن
ئەبین ، خۆ ئەگەر بلێ ـ ئەو شێرە هەڵمەت دێنێ ـ ئەو وەختە بەرابەر
( میتافورا ) ئەبین کە مانای گواستنەوە یا خوازەیە) [1]
ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە ئەم قسەیەی ئەرەستۆ ئەبینین :ـ

١ ـ ئەرەستۆ ووشەی ( خواستن ـ الاستعارة ) ی بەکار نەهێناوە
بەڵکو ( گوازتنەوە ـ النقل ) یا (خوازە ـ المجاز) ی بەکار هێناوە .
٢ ـ ئەرەستۆ لێکچواندنو خواستنی بە شێوەیەکی وا دەرنەخستووە
ناساندنی (مانعو جامع)بدا ، بەڵکو هەر ئەوەندەی کردووە نموونەی
بۆ هێناونو بەراوردی کردوون
٣ ـ ئەرەستۆ جیاوازییەکی ئەوتۆ ناخاتە نێوان خوازەو لێکچواندن
چونکە لە شوێنێکا ئەلێ : «لێکچواندن جۆرە خوازەیەکە ، ئەم
دووەش جیاوازییان زۆر کەمە . » [2]

٤ ـ چونکە خوازەو لێکچواندن بە لای ئەرەستۆوە زۆر لە یەك
نزیکن ، ئەوزاری لێکچواندنی کردۆتە بەڵگە بۆ لێك دابڕاندنیان ..
بە لای ئەوەوە ئەوزار هەبێ لێکچواندنە ، نەبێ خوازەیە ، ووتەی
(ئەوە شێرە) بە رای ئەو خوازەیە نەك لێکچواندن هەر لەبەر ئەوەی
ئەوزاری تیا نییە .ئەمە بوو باوەڕی ئەرەستۆ بەرابەر لێکچواندن
بەڵام راستییەکەی نەخواستن بە شێکە لە لێکچواندنو نە هەر
تەنها ئەوزاریش دیواری دابڕی نێوانیانە چونکە ووتمان ئەو
لێکچواندنەی ئەوزاری تیا نەبێ یا ئەوزارو لێکچوونی تیا نەبێ ئەبێ
بە (لێکچواندنی رەوان ـ التشبیه البلیغ) لە راستیدا خواستن لەسەر
لێکچواندنەوە هاتووە وەك مەسەلەی بناغەو خانوو ، بناغە نەبێ

(1) ، (2) بلاغة ارسطو بين العرب واليونان ـ ابراهيم سلامه ـ

ئاڵۆز ئاگرێتێ ، لێکچواندنێشی نەبێ خواستن نابێ !

که ووتمان خواستن لەسەر لێکچواندن هاتووە ، مەبەست لێکچواندنی بژۆلی – معنوی – یە کە نووسەر لە دڵی خۆیا دروستی ئەکا بێ ئـەوەی دەری ببڕێ ، چونکە خواستن مێلی لێکچواندنی زاراوەییە ، لێکچواندن مەرجە هەر دوولای باس بکرێ بەڵام خواستن تەنها لە یەکێکیان دروست ئەبێو بەس . یا تەنها لەوچوو باس ئەکرێ یا ئەوەتە لێچوو ناو ئەبرێ، پەیوەستێکی لـەوچووی ئەدرێتێ ..

## جیاوازی خواستنو لێکچواندن

لێکچواندنو خواستن جیاوازییان لەم شتانەیە :–

١ – لێکچواندن دوو بنەڕەتی هەیە – لێچوو ، لەوچوو ، کەچـی لـە خواستن یا تەنها لەوچوو ئەووترێ یا لێچوو ئەووترێو پەیوەستێکی لەوچووی ئەدرێتێ . ئەگەر بڵێی (رووی وەکو مانگە) ئەمـە لێکچواندنە بەڵام ئەگەر بڵێی : (پەرچەمی لادا مانگێك کەوتە دەر.) ئەمـە خواستـــتە ..

٢ – خواستنو لێکچواندن هەردووکیان لەم بارەیە رێ ئەکەون کـــە بریتین لە هاوبەش کردنی هەردوو لا لە شتێکەوە بەڵام رێگـــەو چۆنیەتی ئەو هاوبەش کردنە ئەگۆڕێ .

٣ – لە لێکچواندن ئەوە هەر ئەمێنێ کە پیاو هەست بکا لەوچـــوو تەواوترو گەشاوەترە لە لێچوو ، بەڵام لە خواستن هەردووکیـــان تێکەڵ ئەکرێن ، ئەو تێکەڵکردنەش دوو شتەکە پتر لێك نزیـــك ئەکاتـــەوە .

٤ – لە لێکچواندنا لێکچوون ئەشێبووترێو ئەشێ نەووترێ کەچی لـە خواستن بە هیچ جۆرێ لێکچوون نابێ دیار بێ ئەگەر دیار بکەوێ لە خواستن ئەکەوێو ئەبێ بە لێکچواندن ..

خواستـــن بـەم شتانـە نـــەبێ نابـەتـە دی :

١ – فرێ دانی ئەوزارو لێکچوون .. لە دوو لاکەی تریش وەکو ووتمان

یا نەتەنها لەوچوو ناو نەبرێ ، یا لێچوو دێ بەڵام چێیەکێتی لەوچووی ئەدرێتێ .
٢ ــ هەبوونی پەیوەندی‌یەک کە دوو لای خواستن پێکەوە ئەبەستێ ، ئەو پەیوەندی‌یەش هەر وێچوون ئەبێ .
٣ ــ لە بیر خۆ بردنەوەی لێکچواندنی بژۆنی ، چونکە مەبەست ئەوە نی‌یە لێکچواندن دروست بکەین بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەردوو لا لە ناو یەک قالبا دابڕێژرێن .
٤ ــ ئەبێ نیشانەیەک هەبێ کە بێنە ماناى خواستراومان مەبەستە نەک ماناى دروست ئەمەش پێ ئەووترێ (نیشانەی خواستن ــ قرینة الاستعارە ) .

## بنەڕەتەکانی خواستن

کە ئەڵێی : (شێرێکم دی چەکی لە خۆی دابوو مەیدانی ئەخواست ) خواستن لە وشەی ( شێر ) دایە . واتە شێر بۆ ماناى دروستی خۆی نەهاتووە کە دڕندەیە بەڵکو بۆ (پیاوی ئازا) خواستراوە .. نیشانەش بۆ ئەوەی خواستراوە ئەوەیە ئەڵێ :
( چەکی لە خۆی دابوو ، مەیدانی ئەخواست ) ، دیارە چەک لە خۆ دان و مەیدان خواستن هەر بۆ پیاوی‌نە ئەبەردە نەک شێر ، ئەگەر بەم پێی‌یە بۆی بچین بنەڕەتەکانی خواستن ئەمانەن :
١ ــ بۆ خواستراو ــ المستعار لە ــ کە بەرامبە لێچووە لە لێکچواندن .
٢ ــ لێخواستراو ــ المستعار منە ــ کە بەرامبەر لەوچووە لە لێکچوندن ، ئەم دووەش ــ بۆ خواستراو ، لێخواستراو ــ بە دوو لای خواستن خواستن ناو ئەبرێن .. ئەمانەش تەنها یەکێکیان ناوی ئەبرێت وەک باسمان کرد
٣ ــ خواستراو ــ المستعار ــ بەرامبەر لێکچوونە لە لێکچواندن ، ئەمەیان نابێ بە هیچ چەشنێ ناوی ببرێ بەڵام ناو نەبردنەکەی لە بنەڕەتایەتی ناخات ..

٤ ـ پێشانی خوێندن ـ تجربة الاستعارة ـ ئاڕەتی یا ماوەکی ... 
یا گوزارەیێکە کە بەرهەڵستی ئەوە ئەکا ماناى دروستی وشەکانی مەبەست ئەبێ .. گـۆران ئەڵێ :

دایــە نــاو زەمو نــاوە جێگــا نەو جــێـی
هیــچ نەگـۆڕاوە
بەڵام ســوورە گوڵێــك هەیــبــە لـەم دێـیـە
مەنیجــی نــاوە

پێش ئەوەی گۆران بڵێ « سوورە گوڵێك هەیە » ویستوویە بڵـێ « کچێك هەیە » لە دڵی خۆیا ئەم کچەی بە سوورە گوڵ شوبهاندووە جا راستەو خۆ ناوی سوورە گوڵی هێناوە ومەبەستیشی کچەکەیە . بــەڵام کچەکە کە بۆخوازراوە ناوی نەبراوە وهەر بە نهێنی ماوەتەوە ، وە سوورە لێخوازراوە چونکە گۆران شتێکی لەو سوورە گـوڵە خواستووەو کردوویە بە بەر کچەکەدا ئەویش جوانیو رەنگو رەونەق خۆشیە ، ئەم جوانیو رەنگو رەونەقەش پێی ئەووترێ خوازراو کە سێیەم بنەڕەتی خواستنە ، نیشانەش بۆ ئەوەی گۆران گوڵە سووری باخچەی بەهاری مەبەست نیە بەڵکو ئەو کچەی مەبەستە کە ژوانی لەگەڵ بەســتبوو ئەوەیە ئەڵێ : «مەنیجی ناوە » لێرە هەموو دوو دڵی یەك ئەبڕێتــەوەو تەواوی ئەوە ساغ ئەبێتەوە کە وشەی ( سوورە گوڵ ) بۆ ئەو کچــە بەکارهاتووە کە مەنیجــی نــاوە .

## هەنگاوەکانی خواستن

ئایا بۆ هێنانو دروست کردنی خواستن ئەبێ چەند هەنگاو بیڕین ؟ بێ گومان ئەبێ بەم هەنگاوانەدا بڕۆین

١ ـ لێکچوانــدنی نهێنــی :

لە دڵی خۆمان دوو شتەکە بە یەك ئەچوێنین بە بێ ئەوەی ئاشکرای بکەین ، چونکە لێکچواندنی نهێنی بریتیە لە ئامادە کردنو دارشتنی هەر

دوولا ، وه بۆیەش [illegible]

ئەگەر دەربڕی خواستنەکە زیندە بە چال ئەبێ‌و لە شوێن ئەوەوە لێکچواندن دروست ئەبێ •• بۆیە بە هیچ چەشنێ نابێ هەردوو لای لێکچواندنەکە باس بکرێ ••

٢ ـ پەیوەندی هەردوو لا

بریتی‌یە لەو پەیوەندی‌یەی کە لە نێوانی لێچوو ولەوچوودا هەیە • جا ئەبێ بە ووردی تێبینی ئەم پەیوەندی‌یە بکەین کە لە لێکچواندنە نهێنی‌یەکەدا هەیە ، ئایا تا چ رادەیەك ئەم پەیوەندی‌یە گونجاوە ؟ هەر ئەم پەیوەندی‌یە یا سیفەتەشە کە ئەخوازرێ‌و ئەدرێ بە (بۆخوازراو)•• وە پێی ئەووترێ (خوازراو) ••

٣ ـ لە بیر خۆ بردنی لێکچواندنە نهێنی‌یەکە :

لەم هەنگاوەدا هەوڵ ئەدەین لێکچواندنە نهێنی‌یەکە لە بیرخۆمان دەربکەین‌و هەر دوو لای خواستن یا لێکچواندنەکە تێکەڵ بکەین‌و بەتەواوی ئەوە لە مێشکمان دەربکەین کە شتێکمان بە شتێکی‌تر چواندووە بەڵکو بکەوینە سەر ئەم باوەڕە کە ئەم دوو شتە هەردووکیان بە بێ کەم‌و زۆر وەکو یەك وان‌و بە یەك شت ئەدرێنە قەڵەم ••

٤ ـ تێکەڵ کردنی هەردوولا :

مەبەستی هەرە گەورە لە خواستن هوروشنەکاری‌یە ، ئەم هوروشنەکاری‌یەش بە تێکەڵ کرنی هەردوولا نەبێ نایەتەدی ، جا لەم هەنگاوەدا ناوی لەوچوو ـ مشبەبە ـ وەرئەگرین‌و لە شوێن لێچوو دای‌ئەنێین ، یاخود پەیوەستێك لە لەوچوو وەر ئەگرین‌و ئەی دەینە پاڵ لێچوو ، بەم جۆرە ئەم خواستنە ئەبێ بە بەڵگەو ئەوە ئەسەلمێنێ کە دوو شتەکە بە جۆرێ تێکدا رژاون کە ئەگونجێ ناویان بدرێتە یەکترو یەك بۆ ئەوی تر بخوازرێ •

٥ ـ نیشانـــەی خواســـتن :

چۆن خواستن پێویستی بە پەیوەندی نێوان هەردوو لا هەیە ئاواش پێویستی بە نیشانەیەك هەیە ئەوەمان بۆ روون بکاتەوە کە نووسەر یـــا قسەکەر لەم وشەیە مەبەستی مانا خواستراوەکەیە نەك مانای راستەقینەی، ئەم نیشانەیەش یا زمانی ـ لغوی ـ ئەبێ ، یا گوزارەیی ـ معنوی ـ

طاهر بەگی جاف ئەڵێ :

دڵ لـە حەسرەت غەمزەکەی دوو نەرگسی پــر خەوتەوە

وەك خەمی زولفت عەزیـزم چـوو بـە رووداکەوتـەوە

طاهر بەگ (دوو نەرگسی) بۆ (دوو چاو) خواستــووە ، لێـرەدا مەستی پێ کردبێ یا نەکردبێ بە هەموو هەنگاوێکی خواستنا رۆیشتووە تا بەم خواستنە گەیشتووە ، لە دڵی خۆیا بە نهێنی دوو چاوی بە دوو نەرگســـی چــوانـدووەو پەیوەنـــدی نێــوانی چـاوو نێـرگـیش کـــە نەرمی‌یــە بــە ئاشــکرایی لــە هەردووکیــان هەیە ، ئنجا طاهر بەگ ئەم لێکچواندنەی لە دڵی خۆیا دەرکـــــردووەو هەردوولای کردوون بە یەك‌شتو وای داناوە کە چاو ونێرگس یەك شتن‌و موویەك جیاوازی‌یان نی‌یە . ئنجا ناوی (لەوچـوو)ی وەرگرتــووە بـۆ دەربڕینی لێچوو ـ چاو ـ بەو یانووەی کە هەردووکیان ـ چــاوو نێرگس ـ یەك شتن جیاوازی‌یان نی‌یە کە بڵێین نێرگس ) یابڵێین (چاو) . نیشانەش بۆ ئەوەی طاهر بەگ مەبەستی چاوە نەك نەرگس ئەوەیە کە ئەڵێ « غەمزەکەی دوو نەرگسی پڕ خەوتەوە..» چاو ژمارەیان دووە،ئەویش دوو نەرگسی پڕ خەوتەوە . » چاو ژمارەیان دووە ، ئەویش دوو نەرگســی هێناوە ، دیسان غەمزە تایبەتی‌یە بە چاو ، جگە لەمەش خەو تاچێتــە لای نەرگسی هێناوە،دیسان غەمزە تایبەتی‌یە بە چاو ،جگە لەمەش خەو ناچێتە (دوو نەرگس ) کە مەبەسە(دوو چاوە ) نەك دوو گوڵی نەرگس کە لەسەر بنچێکا روابن‌و بە دەم گزەباوە بە لای یەکدا بشەکێنەوە !

## بەشەکانی خواســتن

خواستن بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە دابەش ئەکرێ :

١ ـ خواستنی ئاشکراو خواستنی درکاو ( الاستعارة التصريحية والمكنية)
٢ ـ خواستنی نەژندی‌و خواستنی پاشکۆیی ( الأصلية والتبعية )
٣ ـ خواستنی راستەقینەو خواستنی رامانی ( التحقيقية والتخيلية )

دوو سەرنج :

أ ـ خواستن وەك دەرکەوت شەش بەشە ، ئەو شەشەش جـووت جووت ئەوەستن ، هیچیکیان ناتوانێ لەگەڵ بەرامبەرەکەیا بێت واتە بە هیچ چەشنێك نابێ خواستنێك نەژادیی‌بێو لە هەمان کاتیشدا پاشکۆیی بێت . یا راستەقینەو رامانی بێ پێکەوە ، یا ئاشکراو درکاو بێت پێکەوە .

ب ـ ئەگونجێ یەك خواستن دوو جۆر لەم بەشانەی سەرەوە بگرێتەوە بەو مەرجەی لەگەڵ بەرامبەرەکەیا نەبێت ، وەکو ئەوەی ئەشێ خواستنێك نەژادی‌و ئاشکرایی بێت لە هەمان کاتا ، یا درکاوو رامانی بێ ..

## خواستنی ئاشکراو خواستنی درکاو

### خواستنی ئاشکرا

ئەوەیە راستەو راست وە بە ئاشکرایی ناوی ( لەوچوو ) وەرگیرابێ‌و بۆ دەربڕینی مەبەست خواسترابێ . پیرەمێرد ئەڵێ :

ئەڵێن ساڵێك دوانزە مانگە　　من مانگم دی چواردە ساڵە

( مانگی چواردە ساڵ ) مەبەستی یارە ، مانگی بۆ یار خواستووەو بە ئاشکرایی ناوی لێ‌خواستراو هاتووە کە مانگە ، نیشانەش بۆ سەلماندنی خواستنەکە ئەوەیە ( چواردە ساڵە ) .

خواستنی ئاشکرا دوو جۆرە :

١ ـ خواستنی رێك : هەموو خواستنێك ئەگرێتەوە کە هەردوولای تیا پێکەوە بگونجێن ، وەکو لەسەرەوە باسمان کرد یا وەکو حاجی قادر ئەڵێ :

بە ئومێدی دوو سێی دانەوە حاجی
بە هەرزانی دەدا دەری گرانی

دوری خواستووه بۆ قسەکانی خۆی ، قسەو دوڕ زۆر جار پێکەوه ئەگونجێن که هەردووکیان شتی به نرخو بەهادارن له هەمان کاتیشا بە ئاشکرا ناوی ــ لەوچوو ــ دوڕ ــ هاتووه ، بۆیه ئەبێ به خواستنی ئاشکرا ٠

ب ــ خواستنی به پلار : ئەوەش وائەبێ که نەشێ هەر دوولای خواستن پێکەوه کۆبینەوه چونکه دژی یەکترن وەکو ڕۆناکیو تاریکی که هیچ پێکەوه هەڵناکەن : خواستنی به پلار دوو جۆره : ئەوەته باسی شتێکی نایابو پەسند ئەکاتو به ناوی شتێکی کەم ناوی ئەباوەك باسی پیاوێکی قەلەو بکات وبڵێ : ( پیاوێکی ڕەقو لاوازه ٠٠ ) دووەم وا ئەبێ که باسی شتێکی زۆر گەندو ناپەسند بکەیتو به تەوسەوه ووشەیەکی زلی بۆ بخوازێ وەکو به ترسنۆکێ بڵێی : ( شێر به گوێ ئەگرێ ٠ )

خواستنی درکاو :

ئەم جۆره بەرامبەر خواستنی ئاشکرا ئەوەستێ ، کە بەرامبەریشن بوون ناگونجێ پێکەوه بێن ، ئەم جۆره وا ئەبێ که ( لەوچوو ) فڕێ بدرێ بەلام پەیوەست ــ لازم ــ یکی لێ وەربگیرێو بدرێ به لێچوو ، واته لەم جۆره خواستنه تەنها لێچوو ئەووترێ لەگەڵ پەیوەستێکی لەوچوو ٠ ( نالی ) ئەڵێ :

تا نەگریا ئاسمانو ئەم وولاتی دانەگرت

گوڵ چەمەن تازا نەبوو هەم لێوی خونچه وانەبوو

خواستنی درکاو له ( تا نەگریا ئاسمان ) دایه ٠ لێکچواندنی ئاسمانی کردووه به ئادەمزاد ،ئادەمزادی فڕێداوه که لەوچووه، بەلام پەیوەستێکی لێوەر گیراوه که گریانەو دراوه به لێچوو که ئاسمانه ٠٠ هەر ووشەی ( گریا )شه ئەبێ به نیشانەی خواستەکه ٠

هەندێ کەس خواستنی درکاو به ( لێکچواندنی شاراوه ) ناو ئەبەن

بەم یانووەی لێچوو ئەووترێو پەیوەستێکی لەوچووشی ئەدرێتێ ، کە بەهۆی ئەم پەیوەستە پیاو لەوچووی ئەکەوێتە مێشك .. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا چونکە لەوچوو راستەوخۆ نەهاتووە ، تەنها پەیوەستێکی وەگیراوە ، ئەم پەیوەستەش بۆ ئەوەیە خواستنەکە بسەلمێنێ .. بۆیە ئەم جۆرەش هەر خواستنەو ئابێ بە لێکچواندن .

## خواستنی راستەقینەو خواستنی رامانی

**خواستنی راستەقینە :**

بریتی یە لەوەی (بۆخواستراو) کە بەرابەر (لێچوو)ە ، بەر هەست یا ژیری بکەوێ . گۆران ئەڵێ :

بۆ ماڵ وژن ، بە ژن باوکی چووکی
لە دێیەکی دوور
لە بەندی پیرێکی توند کرد بەپیری
ژاکا گوولی سوور

( ژاکا گوڵی سوور ) خواستنی لێکەوتۆتەوە ، کە یاری بە گوڵ چواندووە ، سووری لە گوڵەکە ( لێخواستراوە ) بۆ یار خواستووە ، لێرەدا دیارە بۆخواستراو شتێکی هەستی یە کە یارە : بۆیە ئەبێتە خواستنی راستەقینە . یا علی کمال باپیر ئەڵێ :

بولبولی بێچارە هەستی کرد کە گوڵ باوی نەما
هاتو سوجدەی بردە بەر باڵای گوڵی زیبای من

**خواستنی رامانی :**

لە خواستنی درگاو ووتمان پەیوەستێکی لەوچوو وەرئەگیرێو ناسۆری بە مرۆڤ چواندووە ، مرۆڤێکی خوێندەوار کە توانای لە هەمان کاتا ئەبێ بە خواستنی رامانی .. شێرکۆ بێکەس ئەڵێ :

## راستەنە پەنجەی ئاسۆر لەسەر تێنی بخشم

## هەلبەستێکی چارەنووسی ووشکی نووسی

ئاسۆری بە مرۆڤ چواندووە ، مرۆڤێکی خوێندەورا کە توانای نووسینی هەبێ ، لەوچوو ــ پیاو ــ فڕی دراوە بەڵام پەیوەستێکی لێ وەرگیراوە کە پەنجەیەو دراوە بە لێچوو کە ئاسۆرە • ئەڵێ ( پەنجەی ئاسۆر ) وەك ئاسۆر خاوەن پەنجە بێت ، ئەم خواستنە وەك زانیمان ، خواستنی درکاوە لە پاڵ ئەمیشا ( پەنجە ) ئەبێ بە خواستنی رامانی

( تخیلی ) چونکە خواستنی رامانی بریتی‌یە لەوەی کە بۆخواستراو نەکەوێتە بەر هەست یا ژیری بەڵکو وێنەیەکی وەهمی رووت بێت • لێرەدا خەیاڵو رامان وێنەیەك بۆ ئاسۆر دروست ئەکا کە لە ئادەمزاد بچێ، هەر ئەو رامانەشە پەنجەیەك بۆ ئاسۆرە خەیاڵی‌یەکە دروست ئەکا کە وەك پەنجەی مرۆڤ بێت • جا هاتووە ( پەنجەی خەیاڵی وێنەی ئاسۆر )ی بە ( پەنجەی راستەقینەی مرۆڤ ) چواندووە ، پەنجە ئەبێ بە خواستنی رامانی ، چونکە بۆخواستراو کە وێنەی پەنجە خەیاڵی‌یەکەیە دەستکردی وەهمو خەیاڵە •• لەم باسەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە خواستنی درکاوو خواستنی رامانی زۆر جار بە یەکەوە دێن ، یا بڵێین لە هەر کوێ خواستنی درکاو هەبێ ، خواستنی رامانی هەیە ، چونکە لە خواستنی درکاو ئەبێ نیشانە هەبێ ، نیشانەکەش پەیوەستێکی لەوچووە ئەو پەیوەستەش ئەبێ بە خواستنی رامانی ، بەڵام وا ئەبێ کە خواستنی رامانی بە تەنها بێتو خواستنی درکاوی لە گەڵا نەبێت بەڵام ئەم کاتە ئەبێ لێکچواندنەکەی بەرایی ئاشکرا بکرێتو خواستنە درکاوەکە نەهێشترێ ، ( بلە ) ئەڵێ :

چۆن ماری دووریت لەزانەویەلی

لازارو دەردت رزانەویەلی

( ماری دووریت ) لێکچواندنی رەوانە ، هەروەها لەوچوو ــ مار ــ

دراوەتە پاڵ لێچوو ــ دووری ــ بەڵام کە ئەڵێ (ئەزاندوویەتی)

دراوەتە پاڵ لێچوو ــ دووری ــ بەڵام کە ئەڵێ ( ئەزاندوویەتی ) ئــەم وشەیە خواستنی لێکەوتۆتەوە ، خواستنی رامانی ــ چونکە خــەیاڵ وێنەیەکی وەك ماری بۆ دووری‌یەکە دروست کردووە ، چۆن مار تەزاندنی هەیە ئاوا بە خەیاڵ تەزاندنی داوە بە وێنە رامانی‌یەکەی دووری، جا هاتووە ( تەزاندنی دووری ) بە ( تەزاندنی مار ) چواندووە ، تەزاندنی مــاری راستەقینەی بۆ تەزاندنی وێنە خەیاڵی‌یەکە خواستووەو لە شوێن ئــەوی دانــاوە ..

### خواســـتنی نـــەژادی‌و خواســـتنی پاشــــکۆیی

خواستنی نەژادی :

ئەو خواستنەیە کە ( لێخواستراو ــ المستعار منه )ی تیا ناوێك یــا شتێك بێ بەو مەرجەی وشەکە ( داتاشراو ــ مشتق ) نەبێ ، بەڵکو جامد بێت .. ( ئـــەختەر ) ئەڵێ :

ســـەرو مالـــم لـــە تۆ گـــەر چاو بـــێ چـــاوم
بلـــێ ئەوســـــاکە ئەختـــەر بـــــێ وەفایـــە

( چاو )ی خواستووە بۆ ( دولبەر) ، چاو کە لێخواستراوە وشەیەکی نەژادی‌یە، واتە لە هیچ شتێکا دانەتراشاوە بۆیە ئەبێ بە خواستنی نەژادی، لە هەمان کاتیشا چونکە بە ئاشکرا ناوی هاتووە پێی ئەووترێ (خواستنی ئاشکرا ) ، دیــان بەر هەست ئەکەوێ کەواتە خواستنی راستەقینەشە .

خواستنی پاشکۆیی :

ئەوەیە کە لێخواستراو وشەیەکی نەژادی نەبێ بەڵکو داتاشراوبێ ، بۆیەش پێی ئەووترێ خواستنی پاشکۆیی چونکە بە دوای خواستنێکــی ترەوە ئەڕوا ئەویش خواستنی نەژادی‌یە .. حاجی ئەڵێ :

غـــەم مەخـــۆ قوربـــان بۆ قوربانی عیـــدی وەصلی تـــۆ
مودەیێکـــە بـــەو ئومێـــــدە حاجی خۆی دابەســـتووە

خواستن لە وشەی ( دابەستووە ) هاتووە ، ئەمەشیان وشەیەکــی داتاشراوە بۆیە پێی ئەووترێ خواستنی پاشکۆیی .

# دابەش کردنی خواستن

خواستن بە گوێرەی هەردوولا و گونجانیان لەگەڵ شتی‌تر ئەکرێ بە سێ بەشەوە :

١ ـ خواستنی پالێوراو ( المرشحة ) :

ئەو خواستنەیە کە شتێکی وای لەگەڵا بووترێ لە رستەکەدا کە شتەکە لەگەل ( لێخوازراو ـ المستعار منه ) بگونجێ و لێی بوەشێتەوە، واتە پەیوەندی‌یەکیان لە نێوانا هەبێ .. ( نالی ) ئەڵێ :

کەس نەکا مەنعی گوڵم گەرچی دڵی کردوومە خوێن
چونکە مەعلوومە کە ئیشی خونچە هەر خوێنخواری‌یە

خواستن لە ووشەی ( گوڵ ) دایە کە مەبەستی یارە ، گوڵ لێ خواستراوە ، ( یار ) ، بۆ خواستراوە . لەم هۆنراوەیەدا ( ئیشی خونچە هەر خوێنخواری‌یە) هاتووە کە بێ گومان خونچە زۆر چاك لەگەڵ ( گوڵ ) ـ لێخواستراو ـ ئەگونجێ .

٢ ـ خواستنی پەتی : المجردة :

ئەوەیە کە لەرستەکەدا شتێکی وای لەگەڵا ووترابێ ئەو شتە پەیوەندی بە ( بۆخواستراو )ەوە هەبێ و لەگەڵیا بگونجێ .. ( بەرزنجی ) ئەڵێ :

لای‌دا سەرپۆش و پەرچەمی شەماڵ
مانگێك هاتەدەر پڕ لە خەت و خاڵ

مانگی خواستووە بۆ روو لە شەوق و پرتەودا (مانگ ) لێخواستراوە ،

( ڕوو ) بۆ خواستراوە ، وە لە هۆنراوەکەدا ( خەتو خاڵ ) هاتووە ، کە پەیوەندی بە رووەوە هەیە ــ بۆخواستراو ــ بۆیە بەم جۆرە خواستنە ئەووترێ ( خواستنی پەتی ) ..

٣ ــ خواستنی بەرەلا ــ المطلقة ــ :

ئەوەیە کە خواستنەکە ئەهێنرێ بە تەنیا بهێنرێو هیچ شتێکی وای لەگەڵا نەبێ کە لەگەڵ ( لێخواستراو یا بۆ خواستراو ) بگونجێو پەیوەندی دار بێت .. گۆران ئەڵێ :

هەر چەند گوڵ سیس نەبێ بگرین

ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین

ئاڵتوونی بۆ گەلای دار خواستووە وە هیچ شتێ راستەوخۆ لە رستەکەدا نەهاتووە کە پەیوەندی بە ئاڵتوون یا بە گەلای دارەوە هەبێ ..

لەم سێ خواستنە دا ، خواستنی پالێوراو لە خواستنی بەرەلاو خواستنی پەتی بە هێزترە ، لە دوای ئەوەوە خواستنی بەرەلا دێت کە لێخواستراو وبۆ خواستراو سەربەخۆ دێنو هیچ شتێکیان لەگەڵا ناووترێ کە ئەم یا ئەو جەخت بکا .. بەڵام لە هەموویان کزتر خواستنی پەتیە چونکە ئەمەیان زۆر زۆر ئاشکرایەو بە هۆی ئەو شتەوە کە لە رستەکە دێت بۆ خواستراو زیاتر دەرئەکەوێ ..

## خوازەی بەرەللا

وتمان خوازەی زمانی دوو بەشە : خواستن ، خوازەی بەرەللا ، تا ئێستا باسی خواستنمانکرد ، جا تۆرەی خوازەی بەرەللایە ، لە

خوازەی بەرەللا وە ئەبێ پەیوەندی نێوان شتە لێخوازراوەکەو ویچوون بێت وەك خوازتن بەڵکو خوازەی بەرەللا بە هیچ پەیوەندی یەك نەبەستراوەو ئەو پەیوەندییانەی کە دوو شتەکە ئەگەیەنە یەکتر ئەوەندە زۆرن ناژمێردرێن ، وا بۆ نموونە چەند پەیوەندی یەك باس ئەکەین :

## ١ - پەیوەندی چاوگی ( المصدرية ) :

کە ئەڵێی ( فلان بە دەستە ) ، دەست بۆ ئەندامی لەش بە کار نەهاتووە ، بەڵکو بۆ دەسەڵاتو توانای کابرا بەکار هاتووە ، کە لەم دوو شتە ئەبینەوە ( دەستی راستەقینەو دەسەڵاتو دەسترۆیشتن ) پەیوەندی نێوانیان لێکچوون نییە ، بەڵکو دەست سەرچاوەی دەسەڵاتەکەیە .. جا ئێمە ناوی سەرچاوەکەمان هێناوەو بۆ شتەکە خوازتوومانە کە دەسەڵاتە .

## ٢ - پەیوەندی هاماوی ( الكلية ) :

ئەو کاتەی ناوی شتێك بە تێکڕایی بەیێتو مەبەستت پارچەیەکی ئەو شتەکە بێت ، یاخود بڵێین هاماو ئەخوازی بۆ دەربڕینی یەك لە پاژە -جزء- کانی ئەم هاماوە ، وەکو بڵێی : « ئاوی دیجلەم خواردەوە » لە راستیدا تۆ هەر برێکت لەو ئاوە خواردۆتەوە نەك هەمووی .

## ٣ - پەیوەندی پاژەیی (الجزئية) :

وا ئەبێ کە ناوی شتێك بە ناوی بەشێکییەوە بەیێت . واتە بۆ دەربڕینی شتێك ناوی بەشێکی وەربگریو بیدەی بەو . (نالی) ئەڵێ :

> لەو شێخە بە کەم مەگرە کە شێخە نەمریدە
>
> لە ریشە بە سەرداری رەئیسێکی بزانە

کە ئەڵێ ( ئەو ریشە ) مەبەستی شێخە .کە ریشەکە پارچەکە لە وجودی شێخەکە ، واتە ناوی پارچەیەکی بۆ دەربڕینی هاماو خواستووە . یا وەکو محمد مولود (مەم) ئەڵێ : «جا هەر بۆ ئەوەی گەلەکەی بە چاکی

ئاژاوقەدا ، بەو هەناوە بری نکات ، لەسەر هەر یەکەی دوو چاوی
دانابوون ، جوولەو بزووتنەوەی خەلکەکەیان لەژمارد ٠٠ » ٠٠ مەبەست
بە دوو چاو خاوەنی ئەم دوو چاوەیە ٠

٤ ــ پەیوەندی شوێنی : (المحلیة ) :

ئەوەیە کە ناوی شوێنێکبیەیتو مەبەستیشت ئەو شتە بێت کە لەو
شوێنە دایە ، گۆران ئەڵێ :

مێوەی گەیشتووی زەردو سووری باخ
جریوەو جووکەی دارستانی شاخ

مەبەستی لە (جریوەو جووکەی دارستان ) جریوە جریوی ئەو مەلو
باڵندانەیە کە لە ناو دارستانەکە دەنگیان تێکەڵ بوودو ئاوازێکی
دڵفرێنیان دروست کردووە ٠٠ وە لێرەدا ناوی شوێنەکەی لخواستووە کە
(دارستانە) بۆ ئەو شتانەی لە وێ دان کە باڵندەن ٠

٥ ــ پەیوەندی هۆیەتی ( السببیة ) :

کە ناوی هۆوو سەبارەتێك بیرێو مەبەست
( بەرهەم ــ مسبب ) بێت ، وەك بڵێی : ( دە دینارم خوارد ) دینار خۆی
کافەزەو ناخورێ بەڵام ئەبێتە هۆی کرینی ئەم شتانەی کە ئەخورێن
وەپەیوەندی نێوان دینار وشتە خوراوەکان پەیوەندی هۆیەتییە ٠

٦ ــ پەیوەندی بەرهۆیی ( المسببیة ) :

ئەوەیە کە ناوی ( بەرهۆ ــ مسبب ) بووترێو مەبەست باسو
سەبارەتی شتەکە بێت کە دەست کەوتووە ٠ وەکو :

بۆ هەولو تەقەلا پارە لە هەوا ئەباری
گیرفانی هەموو چۆلو چیا پڕ بوو لە درهەم

(پارە لە هەوا ئەبارێ) نەبووەو نابێ ٠٠ نەدیتراوە درهەمو دینار

وەکو تەزرەو بەفر دابارێ ، بەڵام ئەوەندە [illegible] بڕانن بە ئاسمان ئەبارێنێ
ئەیـە هۆی دەرچوونو پێگەیشتنی دەغڵو دان ، ئەو دەغڵو دانەش بە پارە ئەدرێ ، کە واتە پارەکە ـ درهەم ـ بە هۆی بارانەوە چنگ ئەکەوێ، باران هۆی پەیدابوونی پارەکەیەو پارە بەرهۆی بارانە ..

جا لێرە (بەرهۆ) مان وەرگرتو مەبەستیشن (هۆ)یە کـە بارانـە .. هەروەکو ئەوەش هەیە کە ئەڵێ (رەحمەت باری )٠

۷ ـ پەیوەندی پەیوەستیو پەیوەستراوی ( اللازمیة والملزومیة ) :

وەکو ئەوەی دوو شت پەیوەست پەیوەستراو بن وەکـو (ڕۆژو ڕۆناکی) ( ئاگرو گەرمی ) .. کە ئەڵێی (هەتاو دەرکـەوت) مەبەسـت ڕۆژو هەتاو پەیوەستو پەیوەستراون ٠ ڕۆژ هەبێ هەتاو هەیە ، هـەتاو هەبێ ڕۆژ هەیـە ..

۸ ـ پەیوەندی خاوەنێتی ( المالکیة ) :

ئەوەیە کە یەکێ خاوەنی شتێك بێت ، جا تۆ ناوی خاوەنەکەی بەیتو مەبەستیشت شتەکە بێت ، وەك بڵێی (مەولەوی)م بە ووردی خوێندەوە مەبەست دیوانەکە یا بەرهەمەکانیەتی .. ناوی خاوەنی بەرهەمەکانـسـان خواسـت بۆ بەرهەمەکـان ..

۹ ـ پەیوەندی هەبوونـی ( المملوکیه )

ئەوەیە کە یەکێك خاوەنی شتێك بێتو تۆش ناوی شتەکە بەیـتو مەبەستیشت خاوەنی شتەکە بێت .. عبدالله پەشێو ئەڵێ :

لـە هـەر خاکـــێ دۆلار بــژی
بژێنمـــەوە ســـەد ( گیڤـــارا )

مەبەست بە (دۆلار) خاوەنی دۆلارە کە ئەمریکای داگیرکەرە ..
ئەمە هەندێ نموولە بۆ ئەو پەیوەندییانەی کە ئەکەونە نێوان مانای دروستو مانای خوازراو لە خوازەی بەرەلادا .. لـە ڕاستـیدا ئـەم

پەیوەندییەکانی ئەوەندە زۆرن کە نەژمێردرێن بەڵام ئێمە لە بەوەستانەوەی سەرەوە وازمان هێنا ئەوەمان لەبەر چاو بوو کە (مستی لمولەی خەرمانێکە ) .

## ٢ ـ خوازەی ژیری ـ المجاز العقلی ـ

خوازەی ژیری بریتییە لەوە کە شتێك بدەیتە پاڵ شتێکیتر کە لە راستیدا هەق نەبێ بدرێتە ئەو ، وەکو ( ئەسکەندەر لەشکرەکەی دارای شکاند ) ، وە نەبێ هەر بە تەنها ئەسکەندەر چەکی هەڵگرتبێو دوژمنی بەزاندبێ ، بۆی هەیە هەر شەڕیشی نەکردبێ بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو فەرمانی بە سەربازەکان داوە بۆ لێدانو رەتاندنی دوژمن . سەربازەکان دوژمنیان شکاندووە کەچی ناو بۆ ئەسکەندەرە ، کەواتە ئێمە شکاندنی لەشکرەکەمان دایە پاڵ ئەسکەندەر هەر لەبەر ئەوەی کە فەرمانو ژیری ئەوی تیایە . یا وەکو بڵێی : « نبوخذنصر باخچە هەڵواسرا وەکانی لە بابل دروستکرد . » لێرەدا ئاشکرایە کە تۆڵی لە قوڕو قوڕەکاری هەڵنەکردووە بەڵکو تەنها ژیری بە کار هێناوەو فەرمانی دروستی کردنی باخچەو کۆشکەکانی داوە ، کەچی شان بە قوڕو کرێکارە رەنجکێشەکان تیا چەوسانەتەوەو هەڵیان ناوە ..
بۆمان دەرکەوت کە خوازەی ژیری لە دانەپاڵ هاتووە ، دانە پاڵیش ( الاسناد ) گەلێ زۆرە :

١ ـ دانە پاڵ هۆ ( الاسناد الی السبب ) :

وەك بڵێی : ( کۆشکێکم دروستکرد) ، لە راستیدا تۆ خۆت لەبەر قوڕکێشانو کەرپووچ هێنان نەناوە تا ئەو کۆشکە بە زۆری بازووی پۆلاینی خۆت دروست بکەی ، بەڵکو کرێکاری ماندوو ئارەقەی روولی لەسەر رشتووەو هێزو ووزەی خۆی لەسەر تواندۆتەوە هەتا هەڵی ناوەو دروستی کردووە ، کەواتە راستییەکەی کرێکارەکە کۆشکی دروست

بەلام چونکە لەسەر بڕیاری ئۆز بۆ ... [illegible]
کردووە ، دروستکردنی کۆشکەکە ئەدرێتە پاڵ تۆ کە بۆوێ بە هۆی بنیات نالی کۆشکەکە .

٢ ـ دانە پـاڵ کات ( الاسناد الى الزمان ) :

ئەوەیە لە کاتێکا کە ئیشێ بکرێو لەجیاتی ئەوەی ئیشەکە بدەیتە پاڵ بکەری خۆی بچی یدەیتە پاڵ ئەو کاتەوە کە ئیشەکەی تیا کـراوە ، هـــەردی ئەلـێ :

قەت نەدەی ئازاری گیانی مەستو بێدارانی شـــەو
خۆت نەخەیتە بـەر شەپۆلی ئەشکی بێ پایانی شـەو

کە ئەلێ ( ئەشکی بێ پایانی شـەو-) مەبەستی ئەشکی ئەو نائومێدو دلـوتاوانەیە کە لەو شەوەوە لە دۆزەخی ژانو ئازارا ئەژیـنو لافاوی فرمێـسکی خوێنینیان هەڵەکات ، جا چونکە ئەشك رشتنەکە لە شـەودا بووە بۆیە ئەشکەکەی داوەتە پاڵ شەو کە کاتی ئەشك رشتنەکەیە .

٣ ـ دانە پاڵ شوێن (الاسناد الى المکان ) :

ئەوەیە کە ناوی شوێنێ بهێتو مەبەستـت ئەو شـتە بێت کـە لە شـوێنەکە دایە . گۆران ئەلێ :

تەبیعەت زەردو ژاکـاوە لە حالی گیـان کەنشتابـــە
نیشـــــانەی ماتەمی پایـــز لـە فرمێسکی درشتایە

سروشت ـ طبیعة ـ هەر سروشتەو ناگۆڕێ ، ئەوەی کە گۆڕانی بـە سەرادێت ـ زەرد ئەبێو ئەژاکێ ـ ئەو شتانەن کە لە سروشتەکـەدا هـەن ..

# بەشـــی سێیـــەم

## درکـــــــــە ... !

درکە ئەوەیە کە راستەو راست ناوی شتێك نەبەی بەڵکو بچی ناوی شتێکی‌تر بەی کە پەیوەندی بە مانای یەکەمەوە هەبێت بۆ ئەوەی پیـــاو لەو مانا باسکراوە بۆ مانا مەبەستە هێما بۆکراوەکە بچێ .

یاخود درکە ئەوەیە ووشەیەك یا کۆمەڵە ووشەیەك بێنی کە واتایەکی دروستی خۆی هەبێت هەر لەو کاتەدا لە رستەکە مانایەکـی تر بـــدا بـــە دەستەوە وە مەبەست ئەم مانایەی بەم دواییە بێت ، دیسان ئەشێ واتـــا دروست‌و ئەزادی‌یەکەت مەبەست بێ چونکە هیـــچ نیشانەیـــەك نی‌یە بەرهەڵستی ئەوە بکات کە مانا ئەزادی‌یەکەت مەبەست بێت ، وەکو ئەوەی لە جیاتی ئەوەی باسی چاوتێری‌و دەسوازی یەکێك بکەیـــت‌و بڵێـــت : « فلان چاو تێرو دەست بڵاوە لە راست هیچ کەسێکەوە خاوەن ماڵ نی‌یە » بەڵێ ئەم قسەیە راستە بەڵام پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن هەیە کەچی ئەگەر بە درکە دەری بیڕی‌و بڵێی « سەردەرەی دەرگایان بلندە .. » ئەم قسەیە لەگەڵ ئەوەی سەخاوەتی‌و مێوانداری کابرا ئەدرکێنی لەگەڵ ئەمیشا بەڵگـەی سەلماندنیشـــی لەگـەڵایە بەڵگەشـــی ئەوەیە کە ئەڵێ « سەردەرەی دەرگایان بلندە » وبارو بارخانەی مێواناتی بە فراوانی تیـــا دێتـــە ژوورەوە .

## جیاوازی درکەو خوازە ..!

درکەو خوازە لەم شتانە لەیەك جیا ئەکرێنەوە :

١ ـــ درکە بەرهەڵستی ئەوە ناکات کە مانا ئەزادی‌یەکەمان مەبەســـت بێت کە ئەڵێی ( فلان چۆك درێژە ) ئەتوانی بڵـێی مەبەست چـــۆك درێژی‌یەو هیچی‌تر بە بێ ئەوەی بۆمانا درکاوەکە بچیت‌و ئەوە وەربگرێت

که مەبەست (هێزی)یە ، کەچی لە خوازەدا بە پێچەوانەی ئەمە نیشانەیەك هەیە بەرهەڵستی ئەوە ئەکا مانا راستەقینەکەمان مەبەست بێت کە ئەڵێی « شێرێکی چەکدارم دی » هەر ئەبێ مانا خوازراوەکەت مەبەست بێت کە (پیاوی ئازا)یە ، وە ناتوانی بڵێی مەبەستم ( شێری راستەقینەیە) چونکە نیشانەیەك هەیە ئەبێ بە بەرهەڵست ئەویش ووشەی (چەکدار)ە ، چونکە چەکداری هەر بۆ پیاوی ئازایە نەك شێری راستەقینە .. واتە یەکەم جیاوازی درکەو خوازە نیشانەیە ، هەندێ لەو باوەڕەدان کە درکە بۆ خواستن ئەچێتەوەو بەشێکە لە خواستنی ئاشکرا کە (بۆخوازراو)ی تیا ئەپێچرێتەوەو دیار نابێ هەروەها لە درکەش ئەبێ (درکاو ـ المکنی عنه) وونو پۆشراوبێ ، وە ئەڵێن درکە شتێکی تایبەتیو خواستن شتێکی گشتییە ، واتە هەموو درکەیێك خواستنە ، بەڵام هەموو خواستنێك درکە نییە ، راست ئەکەن ئەم جۆرە کەسانە کە جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان درکەو خواستنا هەیە لە بارەی ئەوەوە کە هەردووکیان ماناو مەبەستیان دوورەو ئەکەوێتە پەنا ووشە ناوبراوەکانەوە بەڵام چونکە نیشانەیەك هەیە ئەم دوو پیشەیە لێك ئەکاتەوە ، بە هیچ چەشنێ ناتوانین بڵێین درکە بەشێکی خواستنە ..

٢ ـ لە درکەوە زەین لە پەیوەست ـلازمـەوە بۆ پەیوەستراو ـ ملزوم ـ ئەچێ .. حاجی قادر ئەڵێ :

هەتا وەك ئاگری نێوکان لەگەڵ یەك
ئەگەر توفان بێ لەشکرتان بە پووشەك
لە گوێی گا نووستوون بۆیەکا ریوی
لەسەر ئێوە وەها شێرگیرە وەك سەگ

( لە گوێی گا نووستوون ) درکەیە لەغەفلەتیو بێئاگایی ئەم گەلە .. لە گوێی گا نووستن پەیوەستە ، بێئاگایی پەیوەستراوە ـ وە ئێمە بە هۆی مانای ( لە گوێی گا نووستوون ) ئەتوانین بە مەبەست بگەین کە غەفلەتییە .. بەڵام لە خوازەدا ئیش پێچەوانەیە ، زەینو بیر لە پەیوەستراو ـ ملزوم ـەوە ، بۆ پەیوەست (لازم) ئەچێ .. (حەریق) ئەڵێ :

هەر کەسێ دانگی شعوری بێ شعیرێکی هەیە ••
کە ئەڵێ : ( شعیرێکی هەیە ) ، شعیری خواستووە بە کەمی ، شعیر: ئە بەشێکە لەو کەمە ، کەم پەیوەستە شعیر پەیوەستراوە •• لێرە لە پەیوەستراوەوە ئەچین بۆ پەیوەست ••

## بەشەکانی درکە

درکە یا لە سیفەت ئەبێ ، یا لە خودی شتەکە ، یا لە هاوگری نسبەتـ ئەبێ •

١ ـ درکە لە سیفەتی شت : وەکو :

دوژمنـــی ئەو دانەیـە نـانی پێ لەخـوا •
بیکـوژی پولێکی لـە دەست نایێتـەوە •
گـو کولێنـەوەیەکـی بەراستیـیـە

ئەم سێ رستەیە ، هەریەکەیان رژدیو رەزیلی کابرا ئەدرکێنێ ، وە رژدی خۆی سیفەتێکی کابرایە • حاجی ئەڵێ :

ممکـن نییـە دەر بچـێ لە چنگـی
هەتتـا رەقەمو خەتـی فەرەنگـی

ئەم دێرە هۆنراوەیە زیرەکی کورد ئەدرکێنێ کـە مومکـن نییـە (رەقەمو خەتی فەرەنگی) لە دەست دەربچێ بێ ئەوەی لێکی بدانەوەو تێی بگا ، ئەم هۆنراوەیە درکەیە لە سیفەتێك کە زیرەکیو بلیمەتییە

درکە لە سیفەتی شت دوو جـۆرە :

أ ـ درکەی نزیك : ئەوەیە هیچ هۆ ـ واسطە ـی تیا نەبێ بـۆ گواستنەوەی بیر لە پەیوەستەوە بۆ پەیوەستراو ، بۆیەش درکەی نزیکی پێئەووترێ چونکە پیاو راستەوخۆ تێی ئەگاو وەری ئەگرێ • مەدهوش ئـەڵێ :

بێخەیتە ئاگر بۆن سنۆی لێنایتە

زۆر پەشیمانم ، خۆزگە ئەم دیایە

ئەمەش درکەیە لە روتیو بێبەرگی کە هەر زوو گوێگر تێیئەگا ..
یا ( نالی ) ئەڵێ :

کەللە وەك جەرەی شەرابی پڕ نشاطو تەڕ دەماغ

شێری نەرناهووی بەرگورگی سەفەر ، قامچی نەچێژ

( قامچی نەچێژ )درکەیە لە چوستو رەهوانی .

ب ــ درکەی دوور : ئەوەیە کە زەین بە هی چەند سەبارەتو باسێکەوە لە پەیوەستەوە بۆ پەیوەستراو بچێ ، واتە ئەبێ بایسو هۆیەکی زۆر هەبێتو هێنانو بردێکی زۆر بکەیت تا بگەی بەو سیفەتەی کە رستەکە ئەیدرکێنێ ، هەر لەبەر ئەوەشە پێی ئەووترێ درکەی دوور .. چونکە ئەبێ ماوەیەکی درێژ ببڕی تا بە مەبەست ئەگەی وەکو « پیانی نایێ لە برسا » درکەیە لە نەبوونی کابرا چونکە ئەم رستەیە وا ئەگەیەنێ کە کابرا پیایی نایە ، پیایی نەهاتەکەی لەبەر ئەوەیە مەعدەی خالی یە، بۆیەش مەعدەی بە تاڵە چونکە چی نیە بیخوا ، ئەویش لەبەر دەست کورتیە .. کەواتە لێکدانەوەیەکی باشی ئەوێ تا بەوە ئەگەین کابرا هەژارە .. یا بێ کەس ئەڵێ :

بەلام کە وەختی مانگ هەشتو نۆی بێ

کیسەی چۆل نەبێ هەر خۆی بە خۆی بێ .

٢ ــ درکە لە خودی شتەکە :

ئەوەش وا ئەبێ کە خاسەوێژێك یا پتر بینیت کە هەموویان پێکەوە بە تێکڕایی هەر خودی شتەکە بدرکێنن‌و بەس .. مەولەوی ئەڵێ :

راستش هەر ئێدەن (اظهار)م کەردەن

قەسەم بەو کەسە ئەزاد نەمەرگەن

واتە سوێندم بەو کەسەی کە نەبووەو نامرێ ، لێرەدا ( نەبـــووندو نەمردن ) دوو سیفەتن پێکەوە خودێ خودا دەر ئەخەن ، تەنها خودایـە ئەم سیفەتەی لێ کۆبێتەوە .. یا گۆران ئەڵێ :

بـــه ســـــووریکی لـر ئەستێـــرەی ئینسـانگر
قـــەومی کونـــی خـــــتەوە جەژنـــی ئاگـــر

( ئەستێرەی ئینسـانگر ) درکەیە لە (زەمین)

یاخود وەکو ئەڵێن : « نانە خۆری پێنج ئەنگوسـت » ئەمە درکەیـە لە ئادەمزاد .. لێرەدا دوو سیفەت هەن : یەکەم نان خۆری ، دووەم پێنج ئەنگوستی ،هەردووکیان پێکەوە خودی ئادەمزاد ئەدرکێنن چونکە ئـەم دوو سیفەتە پێکەوە لە هیچ شتێکا نین ئادەمزاد نەبێ ، بەڵێ راسـتە هەندێ گیانداری‌تر هەن پێنج پەنجەیان هەیە ، بەڵام ووشەی پەنجە تایبەتی‌یە بـە ئادەمزادو بۆ گیاندارانی‌تر چەپۆك یا چنجرۆك بەکار ئەبرێ ، ئەوەش بـە جێی خۆی بەڵام خۆ گیاندارانی‌تر وەکو ئەو نان خۆرنین ، یا بـەرێ کەوت قایش بخـۆن ژیانیان بەو نانە نەبەستراوە ، جا دیارە ئـەم دوو سیفەتە (نانە خۆری پێنج ئەنگوست) تەنها خودی ئادەمزاد ئەدرکێنن .

ئەتوانین بڵێین ئەم مەیلو مەتەلانەی لە ناو کوردەواری شـــەوی درێژی زستانی پێ ئەکەنەوە هەموویان بەر ئەم جۆرە درکەیە ئەکـەون : چونکـــە ئـــــەو کەســـــەی مەیلـــێ یا مەتەلـــێ دێنـــێ دوو ســــێ ســــیفەتـی وا دێنـــێ کـە تەنهـا لـە شــتێکدا هەن ، ئەگەرچی تاکە تاکی ئەم سیفەتانە رەنگە باڵ بەسەر شتی‌ تریشا بکێشن بەڵام بەتێکرایی تەنها شتە مەبەستەکە ئەدرکێنن و هیچی‌تر ... ئــەو مەتەلانەش زۆربەیان لە شێوەی سەرواداری رێكو جوان داڕێــژراون ، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو مەتەلە خۆماڵی‌یانــە :

١ ــ جۆ ئەخۆری بار لە پشت ... ئەستێرك

٢ ــ بە سێ برایان مێزەرەك ، بە دوو خوشکان گێزەرەك .. نەرشـەو تیـــرۆك

٣ ــ دووی زەق ، دووی نەق ، دووی رەق ، چرنری چەق .... بزن .

٤ ــ دەرخوولە ، لە دەو فوولە ، پری روونــ ..... دوونــت

٥ ــ شیری لێدەی شەق نابی ، ئاوی لێ دەی تەڕ نابی ... سێبەر .

٦ ــ هەندووکە ، بە دندووکە ، لە پێش حاشان دەلێی بووکە .. چـرا

دەرکە لە خودی شتا ئەکرێ بە دوو بەشەوە :

أ ــ درکەی نزیك : ئەوەیە کە سیفەتەکە یاسیفەتەکان راستەوخۆ شتەکە پیشان بدەن وەك بلێی «گوێدرێژەکەم بەسەر گرتەوە»، گوێ درێژ درکەیە لە «کەر» ئێمە لەگەڵ بیستنی ئەم رستەیــە هەر زوو زوو بۆ لای مەبەست ئەچین چونکە گوێ درێـــژی خاسەویژێکی تایبەتییە بە کەر .

ب ــ درکەی دوور ئەوەیە کە سیفەتەکە یا سیفەتەکان راستەوخۆ بێ ووردبوونەوە خودی شتەکە نەدرکێنن بەڵکو چەند هـۆو سەبارەتێك هەبێ کە ئەو سیفەتە یا ئەو سیفەتانە بگەیەنـــێ بە شتەکە وەکو بۆ درکاندنی ئادەمزاد بلێی : « گیاندارێکـــی رەوانە » ئەمە پێویست بە لێکدانەوە ئەکا کە ئەو گیاندارە رەوانە رەوالیش لە قسەکردنەوە ئەبێت ، کە قسەکەریش بێ دیـــارە ئادەمزادە چونکە ئەم سیفەتە کە قسەکردنە تەنها لە ئادەمـزادا هەیە ئجا لەبەر ئەمە ئەم جۆرە درکەیە پێی ئەووترێ درکـەی دوور .

٢ ــ درکــە لە هاوگری :

ئەوەش وا ئەبێ کە سیفەتێك یا کۆمەڵە سیفەتێك بدەیتە کەسێکەوە یا شتێکەوە ، بەڵام وا نەبێ راستەوخۆ ناوی کەسەکە یاشتەکە بێنی کــە سیفەتەکانی ئەدەیتێ بەڵکو هەموو سیفەتەکان ئەدەیتە پاڵ شتێك کە ئـەو شتە تایبەتی بێ بە کابراوە ، کە سیفەتەکان لەو شتەدا هەبوون مانای وایە لە کابراشدا هەن ... بۆ کەس ئەڵێ :

سەعادەت بوو بە بەرگێکو کرایە بــەر هەموو فــەردێ
نەمــانەخیاری ناخۆشــی لــە دڵ دەرچوو هەمــوو دەردێ

راستەوخۆ سەعادەت ـ بەختیاری ـ نادا بە خەڵکەکە بەڵکو ئەیانکا بە بەرگێکو بەرگەکە لەبەر هەموو خەڵکەکە ئەکا ، جا کە بەرگەکە هەبوو مانای وایە بەختیاری‌یەکەش هەیە ـ کامەران ئەڵێ :

ئەو گوڵەی خەزانی وەرانیو نەمرد    ئەو دڵەی ئاسۆر لە هیوای نەکــرد
ئــەو پریشکانــەی دامردنــــەوە    بەڵام هەمیــسان گریان گرتـــــەوە
ئەو ئەستێرەیەی کشا بۆ ناو چەم    لەســەرەمەرگــا خەندەی لەسەر دەم
ئەو مەلەی‌بای وەشت باڵی هەڵوەران    لە بەســتە ووتن نەکەوت لە ئاســمــان
وان لەنــاو دڵــی منــا میوانـــــن    چونکە نموونەی قەت کۆڵ نەدانن.

کامەران چەند نموونەیەکمان بۆ دێنێ لە تێکڕا نموونەی کۆڵ‌نەدانو نەبەزینو خۆراگرتە ، نموونەی سووربوونە لەسەر ژیان ، نموونــەی سەرشۆڕنەکردنە ، ئەو نموونانە دێنێو ئەیانکا بە میوانی دڵی خۆی ، کە لە دڵی ئەوا هەبوون مانای وایە لەو داهەن بەڵام کامەران راستەو راست کۆڵ‌نەدانەکە نادا بە خۆیەوە بەڵکو ئەو هێزەی کۆڵنەدانە ئەدا بە چەنــد شتێکەوە « گوڵی وەریو کە نەمرێ ، دڵی ئاسۆراوی کە هیوای نەبڕێ ، پریشکی دامردوو کە گڕ بکرێتەوە ، ئەستێرەی سەرەو لێژبوو کە پێ‌بکەنێ، مەلی باڵ وەریو کە بەستە ئڵێ .. » جا ئەو هەموو شتانە ئەکا بە میوانــی لانەی دڵی‌خۆی ، کە ئەو هەموو شتە لە ناو دڵی ئەودا هەبوون مانــای وایە دڵی خەستی کۆڵنەدانە .. یا علی کمال باپیر ئەڵێ :

خەڵکی ئیمرۆ وا لەسەر ئەوجــی فەلەلا جــەولان ئەکــەن
هــەر وەکو ماســی لە دەریــادا ســەفاو ســەیران ئەکــەن
ئەگبەتیو بێ عــەقلی داوێن گیــــری ئــەم کــوردانەیە
بۆیــە تــازە حەز لــە زەرگێو تەپڵو دەف لێــعان ئەکــەن .

# تەوس ـ التعریض ـ

تەوس وا ئەبێ کە یەکێ قسەیەك یا ئیشێك بکا تۆش ئیشەکەیت بە دڵ نەبێتو پەندێ یا هۆنراوەیێ یاقسەیەکی وا بکەیت کە پێچەوانەی ئیشەکەی ئەو بێتو رسوای بکا ، ئەوەی لە ژێرەوە بۆ دەربخا کە ئیشەکەی جوان نیەو پێویست بە هاتەوە سەرخۆ ئەکا .. وەکو ئەوەی یەکێ درۆ بکاتو فیشالی گرەو لە رەشەبا بباتەوە تۆش ئەمەی بەسەرا بخوێنی « درۆ پیاو سووك ئەکا » ، دیارە بە تەوسەوە ئەم قسەیەی پێئەڵێی .

لەوەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە (تەوس ـ التعریض) هەر ئەوەندەیە هێما بۆ مەبەست ئەکا ، ئەو هێما کردنەش لە قسەکەوە دەر ئەکەوێ .. ئەمەشیان بە ئاکە ووشەیەك نابێ بەڵکو بە رستەو دێرە هۆنراوە دەر ئەکەوێ ..

تێبینی :

بە هیچ جۆرێ ناتوانین تەوس بە درکە دابنێین یا بە شێکی ئەوی بدەینە قەڵەم ، وەکو ئەوەی هەندێ کەس (تەوس) بە بە شێکی درکەی دائەنێن ، ئەو کاتەی کە بەم جۆرە درکە دابەش ئەکەن :

١ ـ التعریض ـ تەوس ـ

٢ ـ التلویح

٣ ـ الرمز

٤ ـ الایماء

# فەرھەنگۆکی زاراوەکان

کوردی  عەرەبی

رەوانبێژی  البـــلاغة
روونبێژی  البيـــان
جوانکاری  البديـــع
واتاشناسی : علـم المعانی
درێژبـــڕی : الاطنـــاب
رێـــــه  الاطنـــاب
کورتبڕی : الايجـــاز
لێکچواندن : التشبيه
بنەڕەت  الركــن
لێچـــوو  المشـــبه
لەوچـــوو : المشبه به
لێکچوون  وجه الشـبه
ئەوزار  الاداة
لێکچواندنی جەختاو : التشبيه المؤكد
= بەرەلا : التشـبيه المرسل
= درێژه  التشبيه المفصل
= قولـه : التشبيه المجمل
= رەوان : التشبيه البليغ
= تەخت : التشبيه التسوية
= کـــۆ : التشـبيه الجمع
= بـلاو : الشبيه المفروق
= پێچراو : التشبيه الملفوف
= دووسەره :التشبيه المعكوس
= ئاوەژوو  التشبيه المقلوب

کوردی  عەرەبی

= پەسنديده : التشبيه المفضل
= وێنـــه  التشبيه الصورة
وەكيەكـــی : التشابه
ژیوار ــ دۆخ : الحـال
دزێـــوكـــردن : تقبيح
تـــەوس : التعريـــض
دروســـتوخوازه  الحقيقة والمجاز
دروستیزمانی : الحقيقة اللغوية
دروستی نەریتی : الحقيقة العرفية
خوازه زمانی  المجاز اللغوی
خوازەی بەرەلا : المجاز المرسل
خواســـــتن  الاستعارة
وێچـــوون : المماثلـــه
خوازەی ژیری المجاز العقلی
بۆخواستراو : المستعار له
لێخواستراو : المستعار منه
خواســـتراو  المستعار
نیشانەی خواستن : قرينه الاستعارة
خواستی ئاشکرا : الاستعارة التصريحية
= درکاو : الاستعارة المكنية
= نەژادی : الاستعارة الاصلية
= پاشکۆیی : الاستعارة التبعية
= راستەقینه : الاستعارة التحقيقية
= رامانی : الاستعارة التخيلية
= پالیوراو : الاستعارة المرشحة

| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| خواستنی پەتی | الاستعارة المجردة |
| — بەرەلا | الاستعارة المطلقة |
| چاوگی | المصدری |
| هاماوی | الکلی |
| پارەیی | الجزئی |
| شوێنی | المکانی |

| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| هۆیەتی | السببی |
| بەرەۆیی | المسببی |
| خاوەنێتی | المالکی |
| هەبوولی | الملوکی |
| درکە | الکنایة |
| هاوگری | النسبه |

---

# سەرچاوەکان


١ ـ اسرار البلاغة في علم البيان ـ الامام عبد القاهر الجرجانى
٢ ـ سر الفصاحة ـ للامير ابى محمد عبدالله بن محمد بن سعيد بن سنان الخفاجي الحلبى
٣ ـ مجموع المتون الكبير ـ مجموعة من العلماء (٦٣ متن)
٤ ـ التبيان في علم البيان ـ لابن الزملكان • تحقيق احمد مطلوب وخديجة الحديثي
٥ ـ الصناعتين في الكتابة والشعر ـ ابو هلال العسكري
٦ ـ البيان والتبين ـ الحاجظ
٧ ـ علم البيان ـ الدكتور بدوى طبانه
٨ ـ البيان العربى ـ الدكتور بدوى طبانه
٩ ـ البلاغة عند السكاكى ـ احمد مطلوب
١٠ـ جواهر البلاغة ـ احمد الهاشمى
١١ـ التلخيص في علوم البلاغة ـ الامام جلال الدين محمد بن عبد الرحمن القزوينى الخطيب
١٢ـ البلاغة العربية في دور نشأتها ـ سيد نوفل
١٣ـ الادب والبلاغة ـ ابراهيم على ابو الخشب
١٤ـ فن التشبيه (٣ اجزاء) ـ على الجندي
١٥ـ علم المعانى ـ درويش الجندي
١٦ـ مختصر المعانى ـ سعد الدين التفتازانى
١٧ـ البيان ج٤ ـ لجنة من وزارة التربية والتعليم المصرية
١٨ـ المثل السائر ـ ابن الاثير
١٩ـ بلاغة ارسطو بين العرب واليونان ـ الدكتور ابراهيم سلامة

٢٠ــ البديع في نقد الشعر ــ ابن المعتز
٢١ــ [illegible] ــ بهاء الدين [illegible] [illegible]
صادق
٢٢ــ الادب والنصوص والبلاغة والعروض ــ عمر دقاق وعبد الفتاح عكاش وكامل صيف
٢٣ــ فن الجناس ــ على الجندي

٢٤ــ دفاع عن البلاغة ــ أحمد حسن الزيات
٢٥ــ دراسة في الادب المقارن والمذاهب الادبية ــ صفاء خلوصي
٢٦ــ البلاغة الواضحة ــ على الجارم ومصطفى امين
٢٧ــ رسالة الاستعارة والبيان ــ ملا ابو بكر المير روستمي (مخطوطة)
٢٨ــ الاسلوب ــ احمد الشايب
٢٩ــ المجمل في فلسفة الفن ــ بب كروتشه : ترجمة سامى الدروبى
٣٠ــ الاحساس بالجمال ــ جورج سانتيانا ترجمة الدكتور محمد مصطفى
٣١ــ الاديب وصناعته ــ مجموعة من المقالات : ترجمة جبرا ابراهيم جبرا
٣٢ــ البلاغة العصرية واللغة العربية ــ سلامة موسى
٣٣ــ الذوق الادبى ــ ارلولد بنيت : ترجمة على الجندى
٣٤ــ اراء واحاديث في اللغة والادب ــ ساطع الحصرى
٣٥ــ الجمال والفن ــ الدكتور ماهر كامل
٣٦ــ الواقعية في الادب الكردى ــ الدكتور عز الدين رسول
٣٧ــ اصول النقد الادبي ــ احمد الشايب

٣٨ــ التوجيه الأدبــي. ــ طه‌حسين ، احمد امين ، عبـــد الوهاب عزام ، محمد عوض محمد
٣٩ــ شرح تحفة الخليل فــي العروض والقوافي ــ عبد الحميد الراضي
٤٠ــ فنــون الادب ــ چارلتن: ترجمة الدكتورزكي‌نجيب محمـــود
٤١ــ مێژووی ئەدەبی كوردی ــ علاء الدين ســجادي
٤٢ــ ئەدەبی كوردی‌و لێكۆڵینەوە لە ئەدەبی كوردی ــ علاء الديـــن ســـجادی
٤٣ــ دەستوورو فەرهەنگی زمانی كوردی‌و عەرەبی فارسی ــ علاء الديـــن ســـجادی
٤٤ــ شیعرو ئەدەبیاتی كـــوردی (ب ٢) ــ رفیـــق حلمـــی
٤٥ــ فەرهەنگی خاڵ (٢ جزم) ــ شێخ محمدی خـــاڵ
٤٦ــ فەرهەنگی رابەر ــ گیـــوی موكریانی
٤٧ــ آواو دەستوورا زمانـــی كـــوردی ــ جگـــەر خوێـــن
٤٨ــ فەرهەنگا كوردی ــ جگـــەر خوێـــن
٤٩ــ فەرهەنگی هەڵبەست ــ احمد رشـــوانی
٥٠ــ سایكولوجیەتی خوێندنەوە ــ حه كريم هەورامی
٥١ــ زاراوەی زانستی كوردی ــ نەقابەی مامۆستایان ــ ژمارە ٦
٥٢ــ هەندێ زاراوەی زانستی ــ جمال نەبەز
٥٣ــ دیوانە چاپكراوەكانـــی كـــوردی

# ناواخن

| بابەت | لاپەرە |
| --- | --- |

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

## سوپاس

- بۆ نەقابەی مامۆستایانی کوردستان
- بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد ـ لقی هەولیر
- بۆ مامۆستا اسماعیل حمد سلیمان ـ بەڕێوەبەری قوتانخانەی سیروان ـ هەولێر
- بۆ مامۆستا فاضل رشید ـ سانەوی هەولێر ـ
- بۆ عبد الجبار عبدالله گەردی ئەندازیار
- بۆ کاك محمدی ملا کریم
- بۆ خۆشنووس کاك محمد زادە
- بۆ کاك ممتاز جیهدی

کە هەریەکە بەپێی توانا دەستی یارمەتیان بۆ درێژکردم

- بۆ کاك محمود زامدار ـ کە سەرپەرشتی لە چاپدانی ئەم کتێبەی کرد

رقم الایداع فی المکتبة الوطنیة ببغداد ٦٢٢ لسنة ١٩٧٢